حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٨٧)

# بارودۆخی کورد لەچەند بابەتێکی یاسای نێودەوڵەتاندا

مارف عومەر گوڵ

سلێمانی ٢٠٠٥

منتدى إقرأ الثقافي

**بارودۆخی کورد لەچەند بابەتێکی**
**یاسای نێودەوڵەتاندا**

نووسینی: مارف عومەر گوڵ

بابەت: رامیاری

تایپ: تەرزە خالید

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی روون

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٨٦٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

www.roshnberiekurd . com

منتدى إقرأ الثقافي

# وتەیەك

ئەم لێکۆڵینەوانەی لەم کتێبەدان، لەسەردەمانێکدا نووسراون کەرژێمی سەدام حسێن، دەسەڵاتداربوو. بۆیە بابەتەکان هێڵێکی هاوبەش لە نێونیاندایە، دەربارەی بوونی کوردو مافەکانی بە گوێرەی بنەماو پرینسیپیەکانی یاسای نێو دەوڵەتان. بەتایبەتیش ئەگەر سەرنج لە سەرچاوەو پێکهاتەکانی یاسای نێو دەوڵەتان بدەین و لەوێوە سەرنج بدەینە ئەو سیاسەت و تاوانانەی کە رژێمی پێشووی عێراق لەدژی کورد بەکاری هێناوە، لەئەنجامدا دەگەینە ئەو بڕوایەی کە ئەو رژێمە: تاوانبارە، بەڵام دیاریکردنی جۆری تاوانەکانی بە گوێرەی شێوازو رەفتارەکەی دەخوێندرێتەوە کە لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم کتێبەدا دەردەکەوێ. خۆشبەختانە، چاپکردنی ئەم کتێبە لە رۆژگارێکدایە رژێمی پێشووی عێراق نەماوەو سەرۆکی عێراق کوردەو، سەدام حوسێن و ژمارەیەك لە بەرپرسانی پێشووی عێراقی سەردەمی بەعس لە زیندانداندان و رووبەرووی دادگایەکی عێراقی بوونەتەوە، بە گوێرەی (یاسای جینائی تایبەت بە تاوان لە دژی مرۆڤایەتی ) لە عێراقدا.

کە سەیری بابەتەکانی ئەم کتێبە دەکەین، نابێ ئەوە لەیادکەین لەهەرکات و سەردەمێکدا بێ، بابەتەکان حوکمی خۆیان دەکەن، چونکە پشت بە بەڵگەنامەو سەرچاوە دیارەکانی یاسای دەوڵەتان بەستراوەو. نموونەی زیندووی رووداوەکانیش


منتدى إقرأ الثقافي

خراونەتە روو. واتە، بابەتەکانی ئەم کتێبە لە دوولایەنەوە لە بارودۆخی گەلی کورد کۆڵینەتەوە لە کوردستانی عێراقدا.

یەکەم: لایەتی تیئوری، دەربارەی سەرچاوەو بنەماکانی یاسای نێو دەوڵەتان، هەروەها دەربارەی تاوانی نێونەتەوەی لەدژی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و بەرپرسیارێتی تاوانبارانی ئەو جۆرە تاوانانە.

دووەم: لایەنی پراکتیکی، واتە هەندێ نموونە لەو رووداوانەی کە لەژیانی رۆژانەی دەزگاکانی رژێمی بەعس و ژیانی خەڵکی کوردستاندا رویان داوە، بەبەڵگەو رووداو، بە ژمارەو رۆژەکانیەوە، یا بەناوو پێناسەی تەواوەوە، خراونەتە روو. ئەم دوولایەنەی لێکۆڵینەوەکانی ناو ئەم کتێبە دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە لە نوسینی ئەم بابەتەدا لایەنی زانستی لێکۆڵینەوەی لەم جۆرە رەچاو کراوە تاکو خوێنەر بگاتە ئەنجامی روون، لە تێگەیشتن و خوێندنەوەیاندا، یان بتوانێت دەست نیشانی ماف و ئەرکەکانی دەوڵەت دیاری بکات بەرانبەر گەلان و میللەتان، چ لە چوارچێوەی دەوڵەتەکە خۆیدابێت، یان لە وڵاتانی تر.

ئێستا لە ساڵی ( ٢٠٠٥ ) داین کە رێزدار جەلال تاڵەبانی سەرۆکایەتی عێراق دەکات و ژمارەیەك وەزیری کورد لە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق پۆستیان پێدراوەو لیستێکی کوردی هاوبەش لە پەرلەمانی عێراقدایەو لە جەنگی



منتدى إقرأ الثقافي

نووسینەوەی دەستوری عێراقداین.هیچ دەستورێك ناتوانێت مافەکانی گەلانی تێدا جێگیر بکرێت، ئەگەر نوێنەرانی گەلانی ناوخۆی عێراق بەتەواویی بڕوا بەوە نەهێنن کە هەموو گەلێك لە دونیادا مافی سەربەخۆیی خۆی هەیە، جا بەدیهێنانی ئەو مافە گەل یا میللەت خۆی بڕیار دەدات لەچ قۆناغێکدا وبەچ جۆرێك رازی دەبێ بەشداری لە دەسەلاتدا بکات، یان بەچ شێوەیەك مافەکانی رێزی لێدەگیرێت.

نوسینی بابەتەکانی ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەی بارودۆخی کورد لە عێراقدا لەبەر رۆشنایی هەندێ لایەنی جیاوازی یاسای نێو دەوڵەتاندا.

٢٠٠٥/٧/٢٠

سلێمانی



منتدى إقرأ الثقافي

# پێشەکی:

کە باس لە ئەنفال دەکەین، بەتەواویی پرۆسەی فەوتاندنێکی سەراپاگیریی خەڵکی کوردستان و وێرانکردنی سەرانسەری نیشتمانەکەی دێتەوە بەرچاو، هەر بۆیە مەبەستمانە ڕوونی بکەینەوە چۆن دەتوانین تاوانەکانی زنجیرە هێرشی ئەنفال بوگوێرەی جۆرەکانی تاوانی زنجیرە هێرشی ئەنفال بەگوێرەی جۆرەکانی تاوانی جینۆساید دیاریبکەین. ئەنفال کەسوپای عیراق ساڵی ١٩٨٨ ئەنجامیدا کارەساتێکی گەورە بوو نەك لە مێژووی کوردا بەڵکو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، چونکە ئەو تاوانانە بەهەموو مانایەکەوە تاوانی نێونەتەوەیین، بۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەین، تاوانەکانی ئەنفالەکان وەکو تاوانی جینۆساید دیاری بکەین.

بۆ پۆلێن کردنی تاوانەکانی ئەنفال بەگوێرەی خەسڵەت وجۆرەکانی جینۆساید دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەئەو سیاسەتەی حکومەتی عێراق لەدژی گەلی کورد بەکاری هێناوەسیاسەتی جینۆسایدە.

جیاوازیی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمەش لەگەڵ ئەوبابەتانەی کەپێشتر نووسراون ئەوەیە کەڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی بەکار دەهێنین بۆ شیکردنەوەو گەیشتنە ئەنجام هەروەها لێکۆڵینەوەیە جۆری تاوانەکانی ئەنفال بەگوێرەی جۆرەکانی تاوانی جینۆساید دیاریدەکات.



منتدى إقرأ الثقافي

بۆ پۆلێنکردنی تاوانەکانی ئەنفال لەگەڵ جۆرەکانی جینۆسایددا، دوو ڕێگامان گرتۆتە بەر:

١. لایەنی تیۆری تاوانی جینۆساید وەکو تاوانێکی دڕندانە لەدژی مرۆڤایەتی بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتان.

٢. لایەنی پراکتیکی تاوانەکانی ئەنفال.

بۆ ئەوەی تەوەرەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەڕووی زانستیەوە تەواوکەری یەکتری بن بەم جۆرە دابەشمانکردووە:

بەشی یەکەم: مانای جینۆسایدو ئەنفال.

بەشی دووەم: جۆرەکانی جینۆسایدو تاوانەکانی ئەنفال.

بەشی شێیەم: ئەنفال و پەیماننامەی بەربەند کردنی تاوانی جینۆسایدو سزاخستنە سەر تاوانکارانی.

بۆ گەیشتنە ئەنجامیش چ لەڕووی پراکتیکی تاوانەکانی ئەنفال و چ لەڕووی تیۆریەوە دەربارەی جینۆساید، پشتمان بەو سەرچاوانە بەستووە کە باوەڕپێکراون و دەیانکەینە بناغەی زانستی لێکۆڵینەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی یەكەم

# جینۆسایدو ئەنفال

جینۆساید تاوانێكی دڕندانەیە لەدژی مرۆڤایەتی، بۆیە وەكو تاوانێكی نێونەتەوەیی لە یاسای نێو دەوڵەتاندا بەمانای فەوتاندنی بەشێكی یا سەرجەم كۆمەڵە مرۆڤێكی دیاریكراوە[1].

فەوتاندنی هەر كۆمەڵە مرۆڤێك ئەگەر بەشێكیشی بێت و لەهەر جێگایەكی دونیا بێ، ئەوا دەبێتە تاوان لەدژی سەرجەم مرۆڤایەتی.

چونكە هەر كۆمەڵە مرۆڤێك بەداب و نەریت،كەلتوور، مێژوو، زمان و شارستانیەتی خۆی پێوەندی بە بەشەكانی تری مرۆڤایەتیەوە هەیەو لەدان و ستاندنێكی بەردەوامدایە.

یەكەمجار ساڵی ١٩٣٢ رافیل لیمكین Raphal Lemkin لە كۆنفرانسێكدا لەمەدرید وشەی جینۆسایدی بەكارهێناوەو ساڵی ١٩٤٤ بەنوسین تۆماریكردوە كە بەمانای فەوتاندنی رەگەز دێت[2].

جائەو فەوتاندنە چەند جۆرێكی هەیە(وەكو لەبەشی دووەمی ئەم باسەدایە). ئەو فەوتاندنە هیچ كەسێك وەكو یەكێكی دیاریكراو ناگرێتەوە، بەڵكو لەبەر ئەوەی سەر بەو كۆمەڵە



منتدى إقرأ الثقافي

مرۆڤەیە کە دەستنیشان کراوە بۆفەوتاندن.بەگوێرەی بیرورای لیمکین تاوانی جینۆساید کۆمەڵە کارێکە بەمەبەستی تێکدانی بنەما سەرەکیەکانی ژیانی کۆمەڵێکی نیشتمانی تاکو بفەوتێندرێن، ئەویش بە تێکدانی دەزگای سیاسی، کۆمەلایەتی، کەلتوری‌وزمان، ئابوری‌و هەستی نیشتمانی‌وئاینی[٣].

کەواتە ، جینۆساید تاوانێکە بەپلانو نەخشەی جۆراو جۆرو درێژ خایەن ئەنجام دەدرێت، ئەمەش سەرباری فەوتاندنی راستەو خۆی خەڵکی، پێکهێنانی هەلو مەرجێکی‌سەختی دەوێ تاکو تاکەکانی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەی کە ئامانجی‌تاوانەکەیە لەمردنێکی لەسەرخۆدابن هەتا یەکێتی هاوبەشی نێوان ئەندامانی لەبەریەك دەترازێ.

ئەگەر بەگوێرەی ئەو بۆچوونەی سەرەوە ، سەیری تاوانەکانی ئەنفال بکەین بەراشکاویی تایبەتمەندیی‌و چۆنیەتی تاوانی جینۆساید لەتاوانەکانی ئەنفال دا دیاری‌یدەکرێن.

ئەنفال زنجیرە هێرشێکی سەربازی بوو لەناوچەکانی کوردستاندا سوپای عیراق لەبەهاری ساڵی١٩٨٨ دەستیپێکردو بەهەشت قۆناغ لەپایزی هەمان ساڵدا کۆتایی پێهێنا.

ئەو زنجیرە هێرشە بە بەرنامەیەکی سەربازی، موخابەراتی، ئابوری‌و یاسایی حکومەتی عیراق ئەنجام درا کە چەکی کیمیاوی‌و فسفۆریشی تێدا بەکارهێنراوە.

پێش دەستپێکردنی هێرشەکان ئامادەکاریی تەواوی بۆ کرابوو، حکومەتی عیراق سەرجەمی ئەو ناوچانەی دیاریکردبوو کە هێرشیان بۆ دەکات‌و کەرەسەو پێویستیەکانی ئەنجامدانی



منتدى إقرأ الثقافي

هێرشەکانی دابین کردبوو، بەربڵاوی و توندوتیژی و رەفتاری سوپاو سەرجەم دەزگاکانی پەیوەندار بەو هێرشانە ئەوە دەردەخەن کە ئەو زنجیرە هێرشانە سیاسەتێکی لەپڕوکاتی نەبوو، بەڵکو سیاسەتێکی پێشینەو ئامانج دوری حکومەتی عیراق بوو،کەئاسەوارێکی خراپ و ترسناکی بەهەموو لایەنەکانی ژیان و مێژوی گەلی کوردەوە جێهێشتووە.

کەواتە، وەکو چۆن تاوانی جینۆساید لەپڕدا ئەنجام نادرێت بە سیاسەت و پلان و ئامانجی جۆربەجۆر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی دور ئەنجام دەدرێت. بەهەمان شێوەش هێرشەکانی ئەنفال پێشتر نەخشەیان بۆ کێشرابوو بۆ فەوتاندنی بەشێکی گەلی کوردو وێران کردنی نیشتمانەکەی، بەوێرانکردنی سەرجەم بنەمای ئابوری و کەلتووری وتێکدان وشێوەی ئاسایی ژیانی خەڵکەکەوە بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی یەك بەیەکی خەڵکی کوردستان تاکو لەدۆخی مردنێکی لەسەرخۆدا بمێننەوە ڕابردوی خۆیان لێ بشێوێ و ئەوەی دەمێنێتەوەجارێکی دیکە ئەگەڕێنەوە ئەو باری ئاساییەو چوار چێوەی ژیانی ڕابردوی خۆی لەکەلتورو داب و نەریتی دێرینەی وون بێت[٤].

ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان تاوانەکانی نازیەکاندا لەدژی جولەکەکان لەدوای جەنگی دووەمەوە لەگەڵ تاوانەکانی ئەنفال کە حکومەتی عیراق دژی کورد ئەنجامیدا لەگەلێك لایەنەوە لەیەك دەچن.

تاوانەکانی نازیەکان لەدژی جولەکەکان جینۆسایدی سەردەمی خۆی بوو، واتە فەوتاندنێکی سیستماتیك بوو.


منتدى إقرأ الثقافي

بەهەمان شێوەش تاوانەکانی ئەنفالەکان تاوانی جینۆسایدبوو. دەبێ لێرەدا ئاگاداری ئەو راستیە بین لەتاوانیجینۆسایدا ئەندازەیەکی دیاریکراو نییە بۆ فەوتاندنیمرۆڤ، بەڵکو مەبەستی فەوتاندن هەبێ ئیتر کەمی و زۆری ژمارەی قوربانیان لەبەر چاو ناگیرێت[٥]. بۆیەئاماژەمان بەم راستیە کرد ئەگەر ژمارەی قوربانیانی جولەکە زیاتریش بوبێت لە ژمارەی قوربانیانی ئەنفال ئەوا جۆری جێبەجێکردنی تاوانەکان زۆر لەیەکەوە نزیکن.

لە بارەگای هیتلەرەوە سەرپەرشتی کۆکردنەوەو کوشتنی جولەکەکان دەکرا، لەهەنێ حاڵەتدا گیراوەکانیان سواری پاس دەکردو پەنجەرەکانیان بۆیاخ یا پەردەپۆش دەکرد تاکو بیانگەیەننە شوێنی دیاریکراو بۆ کوشتن یا خنکاندنیان بەگاز، پاشتر نامەیەکیان بۆ کەس و کاریان دەنارد کە بە ئەرکی خۆیانی دەزانن ئاگاداریان بکەنەوە ئەگەر چی بەداخیشەوە کە دکتۆرەکان هەوڵی زۆریشیان داوە بەڵام بەنەخۆشی ئەنفلەوەنزا ئەو کەسە مردووە.[٦] هەر بۆ نموونە لەدوای هێرشی ئەنفالەکان، کاتێك هاوڵاتی (عاسی مستەفا ئەحمەد ) نوسراوێك دەنێرێت بۆ سەرۆکی عێراق سەدام حسێن تاکو چارەنوسی خێزانەکەی و منداڵەکانی بزانێت، دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق لە٢٩\١٠\١٩٩٠دا وەڵامی دەداتەوە کە خێزانەکەی و منداڵەکانی لەکاتی هێرشەکانی ئەنفالەکاندا ساڵی ١٩٨٨ ونبوونە.[٧]

راوول هێلبیرگ دەربارەی مێژووی هۆلۆکوست سێ قۆناغ دەستنیشان دەکات لە فەوتاندنی بەکۆمەڵدا، ئەویش دیاریکردن،

منتدى إقرأ الثقافي

کۆکردنەوەو لەناوبردن[٨] ، بەهەمان شێوە حکومەتی عێراق، بە ماوەیەك پێش دەست پێکردنی هێرشەکانی ئەنفالەکان، ناوچەکانی دێهات نیشینەکانی بە شارۆچکەکانیشیەوە دابڕی بوو لەشارەکان، ئەو ناوچەو خەڵکانەی دیاریکردبووتاکو دەستیان بەسەردا بگرێ ئەوسا سەرونگونیان بکات یا چۆنی دەوێ ئاوا رەفتاریان لەگەڵ بکات.

یەکێك لەو میتۆدانەی کە نازیەکان لە دژی جولەکەکان بەکاریانهێناوە،کۆکردنەوەی گیراوەکان بوو لە ئۆردوگای تایبەتدا ، پاشتر کۆمەڵ کۆمەڵ بەشێوازی جیاجیا دەفەوتێندران، یەکێك لەو جۆرانە، چاڵیان هەڵدەکەندو پیاوو ژن و منداڵیان تێدا گولله باراندەکرد.[٩]

یەکێك لە ئەنفالکراوەکان کە لە ناو کۆمەڵێك گولله بارانکراودا بووە بەبریندراری لە ناو چاڵێکەوە بە رێکەوت و پەلەقاژە توانیویەتی خۆی دەرباز بکات منالێك بووە بەناوی (تەیمور )، لە کاتێکدا کە بە شۆفەڵ خوڵکراوە بەسەر گولله بارانکراوەکاندا کە ژن و پیاوومنداڵ بوونە، تەیمور بەتاریکی توانیویەتی دەربازی بێ وخۆی ون بکات.[١٠]

سوپای عێراق لە هێرشی ئەنفالەکاندا جیاوازی نەکردووە لە نێوان خەڵکی مەدەنیو چەکدارەکانی بزوتنەوەی کوردا،وەکو یەك گیراون وکوژراون، کۆلۆنێلێکیئەوسای سوپای عێراق بەرێکخراوی میدل ئیست و وچی راگەیاندووە کە (فەرمانیان بۆ هات هەرچی پێشمەرگەیە بیان کوژن، تەنانەت ئەوانیشیان کە خۆ بە دەستەوە دەدەن، هەروەها ئەو راگەیاندووە کە (فەرمانیان


منتدى إقرأ الثقافي

بۆ هات هەرچی پێشمەرگەیە بیانکوژن، تەنانەت ئەوانەشیان کە خۆ بەدەستەوە دەدەن، هەروەها ئەو جوتیارە مەدەنییانەش کە لە ناوچەی قەدەغەکراودا بوون هەر بەپێشمەرگە دانرابوون، کەوا بوو تەواوی پیاوانی ناوچە قەدەغە کراوەکان کە تەمەنیان لە (١٥-٦٠) ساڵ بوو دەبووبەتێکدەر دابنرێن و بکوژرێن، ناوچە قەدەغە کراوەکان لەنەخشە سەربازیەکاندا بەڕەنگی سوور دیاریکرابوون و رێگاو بانە گشتیە قیرەکانی لێ بەدەر هەموو شتێکی گرتبووەوە)، ئەم فەرمانە وەك ئەفسەرەکە باسیدەکات، بەنوسراوی رەسمی تا ئاستی فیرقەکان دابەزیبوو،دوای ئەوەش بەدەمی بە ئەفسەرە پلە نزمەکان وترابوو، ئەمەش بەگوێرەی نوسراوی (نوسینگەی باکووری)ی ژمارە (٣٦٠) (٤٠٠٨)ی حوزەیرانی ١٩٨٧ کە فەرمانی جێگیریان تێدابوو بۆماوەی دووساڵ بەسەردەمی ئەنفالیشەوە[11].

ئەگەر بەراوردێکی دیکەی ئەنفال بکەین، ئەویش لە گەڵ جینۆسایدی ئەرمەنیەکاندا، بەهەمان شێوە دەبینین یەك ئامانج لە پشت سیاسەتی حکومەتی عێراق و سیاسەتی تورکەکانەوە هەبووە..ئەویش فەوتاندن و وێرانکردن بەهەر جۆرو ئامرازێك بێت، سەفیری ئەمەریکا لە تورکیا (١٩١٣-١٩١٦ )هێزی مۆرگنتا و دەڵێ کە بە هۆی چەوساندنەوەیەکی دڕندانەوە ئەرمەنیەکان لە مردنێکی لە سەر خۆدابوو، لەولایەتەکانی ئەرمینیا رۆژێك نە دەرۆی بەبێ کوشتن و پەلاماردان[12].

بەڵام لەسیاسەتی حکومەتی عێرقداجگە لە کوشتارو وێرانکردنی بەردەوام چەکی کیمیاوی بە شێوەیەکی فراوان

منتدى إقرأ الثقافي

بەكار هات بە هەزاران مرۆڤ بوونە قوربانیو ئاووهەواو سروشت ژەهراوی بوون كە ئاسەوارێكی وا خراپی لێكەوتەوە نەك تەنها مرۆڤ بەڵكو فەوتاندنی یان (كوشتنی ژیان) بوو بۆ هەمووگیانداریك.

لەرۆژگاری كوشتاری ئەرمەنەكاندا لەپێش جەنگی یەكەمەوە وەكو خیانەتكار سەیری ئەرمەنەكان دەكرا، هەمان كات بۆ ئەوەی توركەكان ئەرمەنەكان بۆ سوودی خۆیان بە كار بێنن حیزبی ئتحادی توركەكان داوای لە حیزبی تا شناقی ئەرمەنی كردوە كە یەكەم بۆ نیاز پاكیو دووەم بە مەبەستی بەكارهێنانی ئەرمەنەكان كە گروپی چەكداری ئەرمەنی پێك بێت یارمەتی توركەكان بدەن لە شەڕەكانیاندا چ لەدژی روسەكان یا بە كارهێنانیان بەهەر جۆرێكی تربێت، ئەنجامەكەیشی زۆر خراپ دەبێ بۆ ئەرمەنەكان ئەگەر هاوكاری توركەكان نەكەن.[١٣]

بە هەمان شێوە حكومەتی عیراق سیستمی جاشە كوردەكانی بە كاردەهێنا لە دژی كورد خۆی، بەتایبەتیش لە سەردەمی ئەنفالەكاندا جگە لەوەی پارەیەكی زۆری بۆیان خەرج دەكرد، بەگوێرەی بڕیاری رەسمی حكومەت ژمارە ٤٠٠٨/٢٨ لە ١٩٨٧/٦/٢٠ دا، ئەو چەكدارە كوردانە بە ناوی (الافواج الخفیفة)و(افواج الدفاع الوطنی)یەوە دەستیانكراوە بوو لە تالانیو وێرانكردنو بردنی هەرشتێكدا كە مەبەستیان بووبێ[١٤].

لێرەدا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە هێرشەكانی ئەنفالەكان بەمجۆرە ئەنجامدراون:


منتدى إقرأ الثقافي

١- پێش دەستپێکردنی هێرشەکان رژێمی عێراق ئامادەیی تەواویی هە بووەلە هەمووبوارەکاندا.

٢- ئەو ناوچانەی دیاری کردبوو کە هێرشیان بۆ دەکات .

٣بەگوێرەی بەڵگەنامەکانی رژێمو بە کردەوەش دێهاتەکانی کوردستان مەبەستی سەرەکی هێرشەکان بوونە، ئەمەش راستەوخۆ خەڵکی مەدەنی دەگرێتەوە.

٤-لە هێرشەکاندا جیاوازی نەکراوە لە گەڵ کەسانی چەکداری بزوتنەوەی کوردو خەڵکی مەدەنیدا بەمنداڵو ئافرەتیشەوە.

٥- مەبەست لە سەرجەمی هێرشەکان، دەست بە سەراگرتنی ناوچەکان، گرتنی خەڵکێکی زۆر، فەوتاندنیان، وێرانکردنی دێهاتەکانو سەرچاوە ئابووریەکانی شوێنی ژیانی خەڵکی کوردستان،کە شوێنی حەوانەوەی هێزەکانی بزوتنەوەی کورد بووە.

لەبەر ئەم هۆیانە دەتوانین بڵێین کە رەفتاری رژێمی عیراق بە هەموو مانایەکەوە بە سیاسەتی جینۆساید پێناسە دەکرێت.

منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی دووەم

# جۆرەکانی جینۆسایدو
# تاوانەکانی ئەنفال

لەبەر ئەوەی مەبەستی جینۆساید فەوتاندنی هەموو یا بەشێکی هەر کۆمەڵە مرۆڤێکە، ئەو فەوتاندنە تەنها بەکوشتنی راستەو خۆ ئەنجام نادرێ بەڵکو بەهەر جۆرو شێوەیەك بێت، واتە رەنگەمیتۆدی جۆراو جۆر بە کار بێت بۆ ئەنجامدانی سیاسەتی جینۆ ساید.

لەبەر ئەوەی مەبەستی جینۆ ساید گەیشتنە بە ئەنجامێك کە بوونی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك نەهێڵێت بۆیە تێکدان و شێواندنی ژیان،ژینگە، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، کەلتورو مێژووە، بۆیە جۆرەکانی جینۆ ساید بەم شێوەیە دیاریدەکەین:

١- جینۆسایدی فیزیکی (بەدەنی-جەستەیی):واتە کوشتنی ئەندامانی هەر کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو بەهەر جۆرێك بێت.


منتدى إقرأ الثقافي

٢- جینۆسایدی بیولوژی: تەگەرە خستنە بەر پەرە پێدان و تێکدانی رێژەی ئاسایی زیاد بوونی مرۆڤ لەناو هەر کۆمەڵە مرۆڤێکدابێ.

٣ــ جینۆسایدی کەلتوری: قەدەغەکردنی زمان و شێواندن وتێکدانی مێژوو، پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان، رۆشنبیری، کەلتوری نەتەوەیی و هەستی یەکگرتوو، ئایین و شارستانیەتی هەر کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاری کراو.

٤ــ جینۆسایدی ئابووری: برسیکردن و قەدەغە کردن و وێرانکردنی سەرچاوە ئابووریەکانی هەر کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو چ بە مەبەستی قرتێخستن بێت یان بە مەبەستی هەڵکەندنیان بێت لەنیشتیمان و زێی خۆیان[١٥].

ئەگەر بەگوێرەی ئەو دابەشکردنەی جۆرەکانی جینۆساید چاوێك بەهێرشەکانی ئەنفالدا بگێرین دەتوانین چۆنیەتی تاوانەکان و ئەنجامەکانی لەبەر رۆشنایی هەر یەك لەو جۆرانە بخوێنینەوە:

*جۆری یەکەم: جینۆ سایدی فیزیکی (جەستەیی-بە دەنی):

لە هێرشەکانی ئەنفالەکاندا بە کۆمەڵ و تاك کوشتنی مرۆڤ سیاسەتێکی ئاشکراودرندانە بوو، بە گوێرەی قسەی ئەوانەی لە دوای ئەنفالکردن ئازاد کراون، مردنی خەڵکەکەو سوکایەتی پێکردنیان رۆژانە بوبوو بەرووداوی ئاسایی.


منتدى إقرأ الثقافي

لێرەدا بەڵگەنامەیەکی رەسمی رژێم خۆی وەکو نموونەیەکی بچووك دەکەینە شایەت بۆ کوشتاری بە کۆمەڵ: بەڵگەنامەی نهێنی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی ژمارە٢٥١٦٣ لە٢٩ /١٩٨٨/١٠ دا بۆ بەرێوەبەری ئەمنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، روونی دەکاتەوە بە گوێرەی قسەکردنێکی تەلەفۆنی، ئەم کارانە ئەنجامدراون:

١-نۆ تاوانبار، بەگوێرەی بڕیاری (نوسینگەی رێخستنی باکوور) ئیعدام کراون.

٢-نۆزدە گوناهبار، لەبەر ئەوەی لە دێهاتە قەدەغەکراوەکاندا بوون، بە گوێرەی بروسکەی (ئاسایشی رێکخستنی باکوور) ژمارە (٤٠٠٨) لە١٩٨٧/٦/٢٠دا ئیعدام کراون.

٤-فەرمانی ئیعدام کردنی(٤٧) چل و حەوت گوناهبار لە (سەرۆکایەتی دادگای شۆڕشەوە) دەرچووە.

٥-دوو هەزارو پێنچسەدوسی و دوو کەس و (١،٨٦٩) هەزارو هەشت سەدو شەست و نۆ خێزان کە ژمارەیان (٩,٠٣٠) نۆهەزارو سی کەس بوون، لەکاتی ئەنفالەکاندا دەسگیر کراون رەوانەی ئۆردوگای سەربازیکراون لە پارێزگای تەئمیم.[١٦]

نمونەیەکی تر، یەکێك لەو کەسانەی کە خۆی ئەنفالکرابوو،جوامێر حەمە سەعید حەمە سالح لە دایکبووی سالی ١٩٧٥ خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت:



منتدى إقرأ الثقافي

(من لە ئەنفالەکەمناڵ بووم تازە هەڵدەچووم و لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم، دوای ئەوەی بردمانیانە چەمچەماڵ خستمانیانە سەیارەی عەسکەرییەوە بۆ(تۆپزاوە)، لەوێ باوکمیان لە ئێمە جیا کردەوە، هەموو گەنجە کانیان بە بە رچاومانەوە خستە سەیارەوە بەڵامی جلە کانیان لەبەر داکەندن و تەنها کراس و شەرواڵیان کراس و بیجامەیەکیان لە بەریانداهێشتەوەو گواستیانیانەوە نەمانزانی بۆ کوێیان ئەبەن، بەڵام سەیارەکان(١٠)دەقیقە بۆ چارەکێکیان پێدەچوو دەگەڕانەوە ئیتر هەر ئەو جیا کردنەوەیە بوو نەمان بینینەوە تائێستا کەسێك نیە بە سۆراغیان بزانێ.

شەوێکیان ئێمەیان لە دایکمان جیا کردەوەو ئەوەی کە هەراش بوو بردیان، من هەرچەندە (١٣)ساڵان بووم بەڵام بەباڵا بچووك بووم نەمیانبرد، ئێمەیان بردە نوگرە سەلمان، لە هۆڵێکدا دایاننناین، بۆ مان هەبوو لە هۆڵەکانیش بچینە دەرەوە، ئێمە منداڵ بووین سەرمان ئەکردە هەموو کونێکا و خەبەرمان بۆ پیرەکان ئەبردەوە، ئێمە ئاشکرامانکرد مردووەکانمان ئەدەنە(سەگەڕەشەکان)، کۆمەڵێ سەگی زۆر گەورەو دڕبوون لە دەرەوەی هۆڵەکان بوون، هەر یەکێ بمردایە تەرمەکەیان ئەخستە بەردەمی سەگەکان، سەرەتا کەم دەمرد، هەر یەك و دوو سەگەکان هەڵیانئەدڕی و هەر ئێسکە کەیان ئەهێشتەوە، بەڵام دوایی مردووئەوەندە زۆر بوو بووسەگەکانیش لێی بێزار بوون.

منتدى إقرأ الثقافي

لە ژێر هۆڵەکاندا هەموو ژور بوو قفڵیان لێدرابوو، رۆژێ کۆمەڵێك منالی وەك من ویستمان قفڵی یەکێ لەو ژوورانە بشکێنین کە لە تەنیشت ئاودەستەکانەوە بوو تائەویش بکەین بە ئاودەست، کە شکانمان کابرایەکی ریش درێژ بەزنجیر بەسترابۆوە، بەلاّم هەردووکیان رۆحیان لەبەر نەما بوو، نەمانزانی چی بوو رامانکردەوەهۆڵ کە بۆ ئەوانمان باسکرد،ئیتر تەواو ترساین، لەوە دەچوو هەموو ژوورەکانی تریش شتی وایان لێبووبێ، دایکمو ئەوان ئەیان ووت بۆ ئەوەیە ئێمە زیاتر بترسێنن، هەر نەمانزانی چیبوو، بەلاّم بەگوێرەی قفڵەکان کە لە ژوورەکاندرابوون رەنگە ئەوانیش لە تینوان و لە برسان خەڵکی تریان تیا مردبێ، ئیتر لەوەوە ترساین و نەمانوێرا لە باوەشی دایکمان دوور بکەوینەوە، وردە وردە برسیترمانیان دەکرد، تا وای لێهات زۆر کەس لە برسان مردن. من خۆم، خوشکێك و برایەکم لە برسا مردن، دوای ماوەیەکی زۆر ئێمەیان جیا کردەوە بەلاّم کاتێ بوو هەر بەرۆح زیندووبووین وەك قالۆرەمان لێهاتبوو، هاوردمانیانەوە بۆ کەرکوك و دواتر بۆ چەمچەماڵ و بەریانداین، وتیان عافوات دراوە، بەلاّم لەپاش چی، زۆربەی زۆری ئەوخەڵکەی لەوێبوون مردن، تاك و تەرا خەڵکی تیامابوو، بەلاّم گەنجەکان ئەوانەی لە تۆبزاوا جیایانکردەوە هیچ هەواڵێکیان نەماوە تا ئێستا هەر بە ئومێدی ئەوەین رۆژێك بێت هەواڵێکمان دەست کەوێت تا ئەگەر بە مردنیش بێت!![17].


منتدى إقرأ الثقافي

ئەم دوو نموونەیەمان لە هەزاران نموونە هەڵبژاردووە کە چ کارەساتێك بە سەر خەڵکی کوردا هاتووەو چۆن فەوتێندراون.

*جۆری دووەم: جینۆسایدی بیولۆژی:

لەهێرشەکانی ئەنفالەکاندا سوپای عێراق هەموو توانای سەربازی خۆی بەکارهێناوە، ترسناکترین چەکی کوشندەی عێراق گازی کیمیاوی بوو، بە ئەندازەیەکی زۆر بەکارهات، ئەوچەکە جگە لەوەی راستەوخۆ دەبێتە هۆیکوشتنی مرۆڤو هەموو زیندەوەرێك، ئاوو هەواو سروشت ژەهراوی دەکات، ئاسەواری لەسەر ئەوانەی کە لەژیاندا دەمێننەوە درێژخایەنەو مەترسی زۆر لەسەر ژیانی مرۆڤ دروست دەکات.

کاریگەری دوای بەکارهێنانی چەکی کیمیاویەوە لە هەڵەبجەو ناوچەکانی تری کوردسستان کۆمەڵی کورد تووشی گەلێك نەخۆشی کاریگەر بوون، ژمارەی نەخۆشی شێرپەنجە لەزیادبووندایە، ژمارەی ئافرەتانی نەزۆك لەزیادبووندایە،ژمارەی زیادبوونی ئەم حاڵەتانە زۆرە، وەکو: منداڵ نەبوون بۆ ماوەیەکی درێژ، منداڵ بوون بەشێوەی نائاسایی لەمنداڵێك زیاتر، منداڵی نەخۆش و سەقەت و کەم ئەندام، لەدایك بوونی منداڵ بەمردوویی، نەخۆشی پێست، نەخۆشیەکانی دڵ و دەماغ و دەروونی، ئەواتە هێرشەکانی چەکی کیمیاوی کاریگەری خراپی درێژخایەنی هەیە، تاکو مەترسییەکانی گەیشتۆتە زانایانی دونیاو لەمەڵبەندە بەرزەکانی لەدەوڵەتێکی وەکو ئەمەریکادا


منتدى إقرأ الثقافي

لێكۆڵینەوەی زانستی لەسەردەكرێت، ئەوەتا دكتۆر كرستن م. گۆسدێن. لەبەردەم لیژنەی فەرعی قەزایی ئەنجومەنی پیران دەربارەی تەكنەلۆژیا و هەڕەشەی چەكی كیمیاوی و بایولۆژی روونی دەكاتەوە كە كاریگەریی درێژخایەنی لەسەر مرۆڤ و لەسەر ژینگە هەیەو دەبێتە هۆی نەمان وكەم بوونەوەی ئەندامانی ئەو كۆمەڵەی بەرچەكی كیمیاوی كەوتوون.[١٨]

بەهەمان شێوە د.حسێن شەهرستانی جەخت لەسەر ئەوەدەكات كە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی نەخۆشی سەرەتان و نەزۆكی لای مرۆڤ دروست دەكات و كاریگەری لەسەر ژینگە زۆر دەمێنێتەوە.[١٩]

سەرباری كاریگەری چەكی كیمیاوی لەسەر ژیانی كۆمەڵی كورد، فەوتاندنی هەزاران ژن و پیاو، یان هەزاران منداڵ، یان فەوتاندنی پیاوان و هێشتنەوەی ژنان و بە پێچەوانەوە، دەبنە هۆی كەمبونەوەی رێژەی ئاسایی پێشكەوتنی مرۆڤ.

***جۆری سێیەم: جینۆسایدی كەلتوری:**

ژیانی خەڵكی دێهات نشین شێوازێكی تایبەتی بەخۆی هەیەو سەرجەم پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكان بەرئەنجامی تایبەتمەندیەكانی كۆمەڵەكەیە، هەر لەكۆنەوە دێهاتەكانی كوردستان جێگای حوجرەوخوێندنی ئایینی بوونە، هەروەها ئەدیبانی بزووتنەوەی كوردایەتی و زانا و رۆشنبیرانی ناوچەكان، ئەمانە بوونە هۆی دروست بوونی زەخیرەیەكی كەلتوری كە


منتدى إقرأ الثقافي

دەستنووس‌وبەرهەمی نوسەران بەشێکی دیاریان بووە، جگە لەوەش زمان‌و ئەدەبیاتی فۆلکلۆرو میللی خەڵکی، سەر چاوەیەکی دەوڵەمەندی کەلتوری نەتەوەیین.

جۆری ژیانی دێهات نشین شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو شێوەی قسەکردنی ناوچەکان، پەند، نوکتە، گۆرانی، هەڵپەڕکێ، یاری، قسەی قۆڕ، شێوەی جل‌وبەرگ، شێوەی بیناو دروستکردنی شتومەك‌و کەرەستەی پێویست‌و جوانکاری، ژیانی ئابوریش داب‌و نەریتی تایبەت بەخۆی بەرهەم هێناوە هەروەها حەقایەت‌و لاوك‌و حەیران‌و بەیت‌و بالۆرەو بەسەرهات‌و بەسەرهاتی مێژوویی، بەوێرانکردنی‌دێهاتەکان‌و نەهێشتنی خەڵکەکەی سەرجەم ئەو کەلتورە تێك دەچێ‌و بەرەو فەوتان دەچێت، سەرجەم پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی جاران تێك دەچن، ژیانی ئاسایی خەڵکی وەکو خۆی دروست نابێتەوە، ئەمەش فەوتاندن‌و شێواندنی بەشێکی دیاری کەلتوری نەتەوەیی خەڵکی کوردستانە.

*جۆری چوارەم: جینۆسایدی ئابووری:

ئاشکرایە ئابووری سەرچاوەی ژیانی مرۆڤە، لە هێرشەکانی ئەنفالەکاندا جگە لە تالانکردنی دێهاتەکان، وێرانکردنی سەرچاوە ئابوریەکانیش مەبەستێکی دیار بوون لای سوپای عێراق ئەمە جگە لەوەی پێش ئەوەی هێرشی ئەنفالەکان دەست پێبکات، بە بڕیاری رەسمی حکومەتی عێراق هەموو خۆراك‌و


منتدى إقرأ الثقافي

پێداویستییەکی ژیانی ڕۆژانە قەدەغە کران لەشارەکانەوە ڕەوانەی دێهاتەکان بکرێت..برسیکردنی خەڵکی ئاژاوەو نەخۆشی بڵاودەکاتەوەو شیرازەی ژیانی ئاسایی ناو کۆمەڵ تێك دەدات.

عەلی حەسەن مەجید کە سەرپەرشتی سەرجەم هێرشەکانی ئەنفالەکانی دەکرد، لەکۆبوونەوەیەکی لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەت لە ١٥/٤/١٩٨٨دا دەڵێ:(لە ئێستاوە ئاردوشەکرو نەوتوئاووکارەبا لەدێهات نشینەکان دەبڕم)[٢٠]، بەکردەوەش ئەم سیاسەتە پێش دەستپێکردنی هێرشی ئەنفالەکان جێبەجێکرا، لەهێرشەکانیشدا کەدێهاتەکان وێرانکران، واتە سەرچاوە ئابووری گرنگی خەڵکی کوردستانیش وێرانکرا، ئەمەش خراپ کاری کردە سەر هاوکێشەی ئابووری نێوان شارو لادێ.

بەدابەشکردنی تاوانەکانی ئەنفالەکان بەگوێرەی جۆرەکانی جینۆساید ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە ئەو هێرشانە لە هەموو ڕوویەکەوە بەرنامەڕێژکرابوون بۆ فەوتاندنێکی سەراپاگیری خەڵکی کوردستان و هەوڵدان بۆ ڕیشەکێش کردنی ژیان بەتەواوی.


منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی سێیەم

# ئەنفال و پەیماننامەی بەربەندکردنی جینۆساید

پەیماننامەی بەربەندکردنی جینۆساید سزا خستنە سەر تاوانکارانی لە ١٩٨٤/١٢/٩ لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بلاوکرایەوە، ئەم پەیماننامەیە ڕێکەوتنێکە لەنێوان دەوڵەتاندا کە دەبێ پێوەی پابەندبن، چونکە بابەت و بنەما یاساییەکانی ئەم پەیماننامەیە بنەمای ئیمپیرەتیڤن و پەیماننامەکە دەبێتە سەرچاوە بۆ یاسای نێودەوڵەتان، بابەتی پەیماننامەکە قەدەغەکردنی تاوانی فەوتاندن و تێکدان و ئازاردانی مادی و مەعنەوی هەر کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراوە لەودنیادا ئەم بابەتەش سەرجەم مرۆڤایەتی دەگرێتەوە.

کۆمەڵی مرۆڤ لەبەر ئەوەی لەدان و ستاندنی بەردەوامدایە لەگەل دەوروبەرو لەگەڵ دونیادا، تاوان لەدژی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك واتە تاوان لەدژی مرۆڤایەتی.



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم پەیماننامەیە لە پێشەکی و نۆزدە بەندو پاشەکی پێکهاتووە، بایەخێکی دیاری هەیە لەیاسای نێودەوڵەتاندا.[٢١]
بەندی یەکەمی ئەوە دیاریدەکات کە بەشدارانی پەیماننامەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن ئەو کارانەی دەبنە هۆی فەوتاندنی مرۆڤ لەکاتی شەڕو ئاشتیدا، بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتان تاوانن، بەشدارن پەیمان دەدەن کە دەست بەکاربن بۆ بەربەندکردنی و سزا خستنە سەر تاوانکاری.

بەگوێرەی بەندی یەکەمی جینۆساید هەر بە ئامڕازی شەڕولەکاتی جەنگدا ئەنجام نادرێ، بەڵکو لەکاتێکیشدا کە شەڕ لەئارادا نەبێ، کەواتە، میتۆدی ئەنجامدانی تاوانەکە هەمە لایەنەو هەرکوشتنی راستەوخۆ ناگرێتەوە.

بۆ ئەنجامدانی هێرشەکانی ئەنفالەکان پێشترو بەماوەیەکی دورو درێژ ئامادەکاریدەکرا، قەدەغەکردنی هاتوچۆی نێوان شارو دێهاتەکان، کێشانەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەکانی دێهاتەکان، بڕینی کارەبای دێهاتەکان، قەدەغەکردنی خواردەمەنی و کەرەسەی کشتوکاڵی لەشارەکانەوە بۆ دێهاتەکان، ئەمە سەرباری ئەوەی کە سیاسەتی حکومەتی عێراق بەرانبەر خەڵکی کوردستان چ لەپێش وچ لەدوای ئەنفالەکان گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بەڵکو گرتن، ئیعدام، تۆقاندن، راگواستن وتەعریب کردن بەردەوامە.


منتدى إقرأ الثقافي

**بەندی دووەمی پەیماننامەکە دەڵێ:**

(مەبەست لەجینۆساید هەر کارێکە لەم کارانە بەمەبەستی فەوتاندنی تەواوی یابەشێکی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك کە ئەم دۆخەیان لەبەرچاو بگیرێ، نیشتمانی یان ئێتنۆگرافی یا رەگەز یا ئاین.)

بەگوێرەی بەندی دووەمی پەیماننامەکە بۆمان دەردەکەوێت پێویستە مەبەستی فەوتاندنی سەرجەم یا بەشێکی کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو هەبێ بۆ ئەوەی جینۆساید دیاری بکرێ، جۆری ئەو کارانە بەپێی هەمان بەندی دووەم بەجینۆساید دیاری دەکرێن ئەمانەن:

١. کوشتنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵە.

٢ـ زیان گەیاندن بە لەش وشێواندنی بیری ئەندامانی ئەو کۆمەڵە.

٣. بەئەنقەست دانانی ئەو کۆمەڵە لەژێر بارودۆخێکی سەختدا کە ببێتە هۆی فەوتاندنی هەموو یا بەشێکی.

٤. تەگەرە خستنە بەرمنداڵ بوون لەنێو ئەو کۆمەڵەدا.

٥. بەزۆر راگواستنی منداڵ لەو کۆمەڵەوە بۆ کۆمەڵێکی تر.

ئەگەر بەوردی سەیری ئەم کارانە بکەین و تاوانەکانی ئەنفالەکان بخوێنینەوە، جۆری فەوتاندنەکە دوولایەنی هەیە:


منتدى إقرأ الثقافي

أ ـ لایەنی مادی: واتە، کوشتن و پەلاماردان و ئازاردان و ئازاردان و نەزۆك کردن.

ب ـ لایەنی مەعنەوی: واتە، دروست کردنی بارودۆخێکی سەخت بەمەبەستی شێواندن و فەوتاندن و پێکهێنانی ئازاری دەروونی و سەر لێشواندن، بەزۆر راگواستنی منداڵ لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە داب و نەریت و زمان و کەلتوریان جیاوازە.[٢٢]

لەهێرشەکانی ئەنفالەکاندا، کوشتن بەشێوازی جۆربەجۆرو بەتاك و بەکۆمەڵ ئەنجامدراوە(وەکو پێشتر باسمانکرد)لەپێش ئەنفالەکان و لەسەردەمی ئەنفالەکانیشدا خەڵکێکی زۆر لە دێهاتەکانی خۆیاز بەزۆرو بەهۆی سوپاوە رادەگوێزران بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ(مجمعات قسریە)، لەو ئۆردوگایانەدا ژیانێکی سەخت و ئاڵۆزیانبۆ دروست ببوو کە کاری خراپی کردبووە سەر بیروهۆش ودەمارومێشك تێکدانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و ئابووری و خێزانیەکانی جاران، هەر لەهێرشی ئەنفالەکاندا منداڵان لەدایکان جیاکراونەتەوە کەس نازانێ چیان بەسەر هاتووە، ئەوەتا دایکێك کەناوی(نەبات فایق رەحمانە)لەدایك بووی ١٩٦١ ناوچەی جەباری، دەربارەی ژیانی زیندانی تۆبزاوە دەڵێت:(منداڵ گشتی لەترسا رەنگی مۆر هەڵگەڕابوو، من خۆم دوو منالم پێبوو(شارۆودیار)باوکیشیان تا ئەوێ پێکەوەبووین، هەر چەندە بەهاریش بوو بەڵام دونیا هەندێ


منتدى إقرأ الثقافي

...رسی کردبوو، ئەو هۆڵانەیش ئەوەندەیان تێ تەپاندبوو ئەتوت جەهەننەمە، هەر خەریك بوو ڕۆحمان دەرچێ لە گەرما، کەچی ...هەندێ هۆڵی تریشەوە بەسۆندە ئاویان کردبووە ژێریان تا سەرمایان بێت، هۆڵەکەی ئێمەش دەرگا وپەنجەرەیان داخستبوو، هەر کونێ نەبوو بۆ هەناسەدانیش، خەریك بوو گشتمان بتاسێین بەو وەزعەمانەوە بەو ترس و دڵە ڕاوکێ و تینوێتی و برسێتیە شمانەوە شەو هاتن لە هۆڵەکەماندا هەرچی منداڵ هەبوو بردیان..نازانم چۆن باسیبکەم، کە ئەو زاڵمانە هاتنە ژوورەوەو پەلاماری منداڵیاندا، هەرچی منداڵ هەبوو وا خۆی ئەنوسان پێمانەوە ئەت وت ئەیەوێ بچێتە ناو زگمانەوە، یەکە یەکە هەرچی منداڵ هەبوو لێمانیان ساند، منداڵێ وا هەبوو ٢٠ ڕۆژ بوو لە دایك بووبوو، پەلیان گرت و بەدەم دەستیانەوە شۆڕ ئەبۆوە ئەتووت پەڕەسێلکەن، بردیانیان. زیق و زاری منداڵ گاوری موسڵمان ئەکرد.[٢٣]

دیارە، بۆ ئەنجامدانی‌تاوان جگە لە کوشتنی ڕاستەو خۆ، دروست کردنی هەلو مەرجی سەخت و لە حاڵەتێکی لە سەرخۆدا، برسیکردن و دابین نەکردنی پێویستییەکانی ژیان، ئەمانە وەکو کرداری تاوان دەژمێردرێن، چونکە تاوان بریتیە لە کرن(القیام بالفعل)وەکو کوشتن، یان نەکردن(الامتناع عن الفعل)وەکو قەدەغە کردنی خواردەمەنی و پێویستییەکانی ژیان.

منتدى إقرأ الثقافي

بەندی سێیەمی پەیماننامەکە نەك تەنها کوشتنی راستەو خۆ بەڵکو سزا دەخاتە سەر ئەم کارانە:

١. جینۆساید.

٢. پیلان گێڕان بەمەبەستی جینۆساید.

٣. هاندانی ڕاستەو خۆو ئاشکرا بەمەبەستی جینۆساید.

٤. هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٥. بەشداریکردن لە جینۆساید.

لەهێرشی ئەنفالەکاندا، دەبینین ئەم شێوازانە رەفتار کراون، کوشتنی راستەو خۆ بە تاكو بەکۆمەڵ، بەبڕیاری رەسمی، سوپا و چەکدارەکانی سەر بە رژێم لە دەزگاکانی راگەیاندنی رژێمەوە بە حەماس و پیاهەڵدانێکی زۆرەوە هانیان دەدان کە هێرشەکانی ئەنفالەکان ئەرکێکی نیشتیمانییەوە لە پێناو بەرژەوەندی وولاتدایە.

لەم شیکردنەوەیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەندەکانی پەیماننامەی١٩٤٨، بەچ جۆرێك پێناسەو تایبەتمەندی جینۆساید دیاریدەکەن، جۆری تاوانەکانی ئەنفالیش بە تەواوی دەخرێتە بەر ئەو دیاریکردن و پێناسە کردنە. کەواتە، دەڵێین کە هێرشەکانی ئەنفال پیادەکردنی سیاسەتی جینۆسایدە.



منتدى إقرأ الثقافي

# ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بە سێ بەش تاوانەکانی ئەنفال-مان لە چوار چێوەی تاوانی جینۆسایدا شیکردۆتەوە، گەیشتوینەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەنفال بە گوێرەی چەمك و مانای جینۆساید تاوانێکی دڕندانەونێو نەتەوەییە، چونکە تاوان بووە لەدژی کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاری کراو کە (کوردن). هەر کەسێك کە بەر شاڵاوی هێرشەکانی ئەنفال کەوتووە رێکەوت نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە کوردە،چونکە بە هیچ جۆرێك جیاوازی نەکراوە لە نێوان کەسانی چەکداردا بزووتنەوەی کوردو خەڵکی مەدەنی کە لە مناڵەوە دەیان گرێتەوە تاکو پیرو پەك کەوتە، چنێر یا مێ.لە باسکردنی جۆرەکانی جینۆسایددا، دەبینین خەڵکی کوردستان لە هێرشەکانی ئەنفالدا، بەر هەر یەك لەو جۆرانە کەوتوون.کوشتنی ڕاستەوخۆ، فەوتاندنی جەستەیی، فەوتاندنی بیۆلۆژی،فەوتاندن و شێواندنی کەلتوری نەتەوەیی و گەمارۆی ئابووری و برسیکردن و وێرانکردنی سەرچاوە، ئابوورییەکان و تێکشکاندنی ئاستی ئابووری نێوان شارەکان و دێهاتەکان.

لەدوابەشی لێکۆلینەوەکەماندا بۆمان دەرکەوت کە تایبەتمەندی تاوانی ئەنفالەکان بە گوێرەی پەیماننامەی ساڵی ١٩٤٨دەربارەی بەربەندکردنی .جینۆسایدو سزا خستنە سەر تاوانکارانی لە یاسای نێودەوڵەتاندا وەکوتاوانی نێو نەتەوەیی


منتدى إقرأ الثقافي

دیاری دەکرێ. جینۆسایدیش لە بەر ئەوەی مەترسییە لەسەر سەرجەم مرۆڤایەتی، پێویستە بکرێتە زەمینەی یاسایی چارەسەرکردنی کێشەی کوردو قەرە بووکردنەوەی زیانەکانی گەلی کورد، لەبەر ئەو کارەسات و زیانە مرۆیی و ئابووری و مەعنەویەی کەلێیکەوتووە، کەواتە، هێرشەکانی ئەنفال تاوانی جینۆسایدەو پێشترو بە بەرنامەو پلانی جۆر بەجۆرە حکومەتی عێراق بەرەسمی ئەنجامی داوە.


منتدى إقرأ الثقافي

## سەرچاوەو پەراوێز

١ـ لێرەدا بۆ ئەوەی هەندێ لایەنی باسەکەمان دووبارە بوونەوە نەبێت، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی مانای جینۆسایدەوە بڕوانە کتێبێکی سەر بە خۆمان بەناوی: جینۆسایدی گەلی کورد لە بەر ڕۆشنایی یاسایی تازەی نێو دەوڵەتاندا.

٢. الدكتور عبدالوهاب حومد:الاجرام الدولي،الطبعة الاولى، مطبوعات جامعة الكويت، ١٩٨٧ ص٢٣٨. هەروەها:د.ئەمیری حەسەن پوور. بەرەو تێگەیشتن و بەربەرەکانی کردنی ئەنفال/ گۆڤاری ئەنفال،ژمارە(١)، سلێمانی ٢٠٠٠ل١٠.

٣. الدكتور عبدالوهاب حومد:الاجرام الدولي،ص٢٣٩ .

٤ـ لە باسکردنی ئەنفالدا بۆ ئەوەی کارەکانی پێشتر دووبارە نەکەمەوە مەبەستە سەرەکییەکانم دیاری کردووە.بۆ زانیاری فراوان دەربارەی تاوانەکانی ئەنفال بڕوانە کتێبێکی تایبەتمان بەناوی: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا،

هەروەها: بڕوانە، جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، ئامادەکردنی میدڵ ئیستووچ. وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سیامەندی موفتی زادە، بلاوکراوەکانی خاک، سلێمانی ١٩٩٩.هەروەها بڕوانە:یوسف دزەیی، ئەنفال-کارەسات، ئەنجام و ڕەهەندەکانی،هەولێر٢٠٠١.

٥. مارف عومەر گوڵ: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا، ئەمستردام،١٩٩٧ل١٤.

٦. ستیفان برو شفیلدوپول أ.لیڤین: كتاب الابادة في أوروبا في الأعوام ١٩٣٣-١٩٤٥، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٨ص٤٦.

٧. زیاد عبدالرحمن: محرقة الموت، الطبعة الاولى، أربيل ١٩٩٥ص٣٨.

٨. بڕوانە: خالید سالح،ئەنفال-جینۆسایدکردنی کورد لە عێراق، وەرگێڕانی: کاوە جەمال./گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە (٧) ستۆکهۆڵم ١٩٩٩ل٩٣-٩٩.

٩. هەمان سەرچاوەی ژمارەی (٦)،ل.٥.

١٠. چاوپێکەوتنی تەیمور: کەنعان مەکیە، وەرگێڕانی فایەق ڕەحیم/گۆڤاری ئەنفال، ژمارە(١) سلێمانی ٢٠٠٠ل١١٧-١٢١.

منتدى إقرأ الثقافي

١١ـ میدڵ ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراقداو پەلاما ری ئەنفال بۆ سەر کورد.وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سیامەندی موفتی زادە سلێمانی ١٩٩٩ل٤٧٠.

١٢ـقتل أمة: مذكرات هنري مورغنطاو،السفير الامريكي في تركيا(١٩١٣-١٩١٦) عن المذابح الارمنية في تركيا، ترجمة الكسندر كشيشيان، حلب ١٩٩٠ص٣٣.

١٣. الدكتور نعيم اليافي:مجازر الارمن، الطبعة الاولى. اللاذقية، ١٩٩٢ص٤١.

١٤ـــ بەڵگەنامـــەی (UN) ئەنجومـــەنی ئـــابووری و کۆمەڵایـــەتی، ژمـــارە E/CN4/1993/4،ل٨٠(دەقـی روسـی).بـۆ زیـاتر زانیـاری دەربـارەی بڕیـاری حکومەتی عێـراق بڕوانـە: مـارف عومـەر گوڵ،ئەنفال قۆناغێکە لـە پراکتێك کردنی جینۆساید/گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە(٧)، ستۆکهۆڵم ١٩٩٩ل٥٦.

١٥. لـەبارەی جۆرەکـانی جینۆسـایدەوە بڕوانـە: جینۆسـایدی گـەلی کـورد لەبـەر ڕۆشـنایی تـازەی نێـو دەوڵەتانـدا. لـە بڵاوکراوەکـانی یانـەی کـوردی میـدیا-ئـە مستردام ١٩٩٧ل٩-١٧ یان: چەمکی جینۆسـاید وەکـو تـاوانێکی دڕندانـە لـە دژی مرۆڤایەتی/گۆڤاری یاساپارێزی، ژمارە(١)، هەولێر١٩٩٦ل١٩ هەروەها بڕوانە:

-گوبین:ڤ.ف: جیـاوازی ڕەگـەز-نـاوەڕۆکی کۆنـە پەرستانەو دژەکـاری یاسـای نێو دەوڵەتان،مۆسکۆ ١٩٧٩ل٥٠-٥١ (بەزمانی روسی)

-ئەنـدریۆخین: جینۆسـاید لـە سیاسـەتی وڵاتـە ئیمپریالییەکانـدا، مۆسـکۆ ١٩٦١ل٨(بەزمانی روسی).

-الـدكتور عبـدالوهاب حومـد:الاجـرام الـدولي، الطبعـة الاولى، مطبوعـات جامعـة الكويـت١٩٧٨ص٢٣٩-٢٤٢. لێرەداپێویسـتە ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـەم کـە بـەڕێز مافناس(عبـاس همـزه خـدر)،لـە بابەتێکیـدا زانیارییـەکی زۆر لـە جـۆری دابـەش کردنی جینۆسایدو تایبەتمەندییەکانیدا،لە لێکۆڵینەوەیەکی ئێمـە وەرگرتـووە کـە پێشـتر لـە ژمـارەی(١)ی سـاڵی ١٩٩٦ل١٩/گۆڤـاری یاسـا پارێزیـدا بڵاوکراوەتـەوە. بەبێ ئەوەی ناوبراو بە شێوەیەکی زانستی ئاماژەی بۆ سەرچاوەکەی کردبێ. بۆ ڕاستی قسەکان بڕوانە(عباس همزه خدر):جینۆساید-کارەساتی کوردو تاوانی نێو دەوڵەتی/گۆڤاری (یاسا پارێزی)،ژمارە (٤)/١٩٩٩ل٢٣٠_٢٣٤.


منتدى إقرأ الثقافي

١٦ـــ بەڵگـــە نامـــەی(UN)، ئەنجومـــەنی ئابووری‌وکۆمەڵایـــەتی. ژمـــارە(E/CN.4/1992/31.P.72)هـــەروەها بەڵگەنامـــەی(UN) ئەنجومـــەنی ئاسایش، ژمارە S/23685/Add.1,9March 1992.p.75 (دەقی رووسی).

١٧ـ عـارف قوربـانی: شـایەتحاڵەکانی ئـەنفال، بـەرگی یەکـەم، سـلێمانی ٢٠٠٢،ل١٧٨-١٧٩.

١٨. شەهادەی دکتۆر کرستن م.گۆسدین،وەرگێرانی: کەمال حەسەن محمەد/ گۆڤاری ئەنفال، ژمارە(١)سلێمانی ٢٠٠٠،لاپەرە٥٧-٦٧.

١٩ـ حوار مع النووی العراقی حسین الشهرستانی. مجله الانفال (القسم العربی).العدد(١)،السلیمانیه ٢٠٠٠ص١٩٢-١٩٥.

٢٠. التسجیلات الصوتیة لاحادیث علی حسن المجید: اعداد-دلاوەر عثمان/ مجلة الانفال(القسم العربي)، العدد(١)،السلیمانیة٢٠٠٠ص١٦٨.

٢١. دەقی پەیماننامەی بەربەندکردنی تاوانی جینۆساید سزا خستنە سەر تاوانکارانی،ساڵی ١٩٤٨.

٢٢ـ الدکتور محمد سلیم محمد غزوي:جریمة ابادة الجنس البشري، طبعة ثانیة،الاسکندریة١٩٨٢ص١٦.

٢٣ـــ عـارف قوربـانی:شـایەتحاڵەکانی ئـەنفال، بـەرگی یەکـەم، سـلێمانی ٢٠٠٣ل١٩٥.



منتدى إقرأ الثقافي

## بابەتی دووەم

# عێراق لە پێشێلكردنی بنەما ئیمپیرەتیڤەكانی یاسای نێو دەوڵەتانەوە بۆ جینۆساید

لە دوای ئەوەی مرۆڤایەتی بەهۆی دوو جەنگی جیهانیو جەنگو كاولكاریی ئەملاو ئەولاوە تووشی كارەساتی گەورەو ترسناك بۆوە. دەبوایە دەوڵەتان بگەنە ئەنجامێك بۆ پێوەندیی نێوانیاندا لەدژی شەڕو بۆ پاراستنی ئاشتی. ئیتر یاسای گشتی نێو دەوڵەتان لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە كە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان پێكهات، چووە قۆناغێكی تازەوبایەخدارەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

لە پێشەكی دەستوری ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكاندا[1]، دەوڵەتان بە ناوی(گەلانی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە) ئەو ئەركەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان كە نەوەكانی داهاتوی مرۆڤایەتی لە كارەساتی جەنگ بپارێزن كە دووجار بەهۆیجەنگی جیهانگیریەوە تووشی كارەساتی وابووە لەباسكردن نایەت. هەروەها باوەڕی دەوڵەتان بەناوی(گەلانی


منتدى إقرأ الثقافي

نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە) دیـاریکراوە بەمافـە بنەڕەتیـەکانی مرۆڤو کەرامـەتی تاکەکـەس و چارەنووسـی، لەگـەڵ یەکسـانی لـە نێوان میللەتانی گەورەو بچوکی دونیادا.

نابـێ لـە بیرمـان بچـێت کـە دەسـتوری ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بەڵگەنامەیەکـە خەسـڵەتی ڕێکەوتننامەیـەکی جیهـانی هەیـە لـەنێوان دەوڵەتانـداو وەکـو پەیماننامەیـەکی دروستکەری بنـەمای یاسـایی بـووە بەسەرچـاوەیەکی گـرنگ لـە یاسای نێو دەوڵەتاندا، چونکە لە ئەنجامی یـەکگرتنی خواستی دەوڵـەتانی دونیـاوە پێکهـاتووەو ئامانجـەکانی سـەرجەم ژیـان و ئاسایشی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە.

بەنـدی(٢٥)ی هـەمان دەسـتور پـەیمانی ئەنـدامانی ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تۆمار دەکات، کە مل دەدەن بۆ بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش و جێبەجێکردنیان بە گوێرەی دەستورەکە.

لەبەرئـــەوەی کـــە وتمـــان دەســـتوری ڕێکخـــراوی نەتەوەیـەکگرتووەکان دروستکەری بنـەمای یاسـاییە، پێویسـتە بـزانین کـە یاسـای نێـو دەوڵـەتان لـە دوو جـۆرە بنـەمای یاسـایی پێکدێت:

١. بنەمای تەواوکـەری یـەکتر کە دەکـرێ بڕیـار لەسـەر جـۆری جیاوازیـان بـدرێت-Regle Declaratives-(قواعـد مکملـە-متممە).


منتدى إقرأ الثقافي

٢. بنەمای ئیمپیرەتیڤ-Regle Impertives-(قواعد آمرة).
ئـەمجۆرەیان خەسـڵەتێکی بـالای هەیـەو نـاکرێ بەپێچـەوانەیان رەفتاربکرێت.

بۆ نموونە: ئەو بنـەما یاساییەی کـە کوشتن قەدەغـە دەکات، پێویستـە رێـزی لێ بگیرێـتو دەبـێ هەموکـەسو لایـەنێك پێـوەی پابەند بن[٢]، هیچ کەسێکیش دەسـەڵاتی ئـەوەی پێنـادرێ خـۆی لەپابەندێتی بنەمای ئیمپرەتیڤ دوورخاتـەوە[٢]، هـەر رێکـەوتنێك یا لەدژی مافی قڕکردن بێت، کارێکی نابەجێیـەو لـەدژی بنـەمای ئیمپیرەتیڤـە[٤]. بنـەمای ئیمپیریتـیڤ(قواعـد آمـره) لەیاسـای نێودەوڵەتاندا پێی دەوترێت(Juscogens).

کۆمـەڵێك هۆکـا‌ر هـەن کـە بوونـە هـۆی دروسـت بـوونو پێکهێنانی بنەمای ئیپیرەتیڤ، وەکو ئەمانە:

١ـ هۆکـاری مێـژوویی:کاریگـەریی مێـژوویی یاسـای نێـو دەوڵەتان.

٢. هۆکاری فەلسەفی: کەبوونە بەهۆی دروست بوونی بەهای مرۆڤایەتیو ئەخلاقی.

٣ــ هۆکـاری کۆمەلایـەتیو پێشـکەوتنی شارسـتانیەتی مرۆڤایەتی.

٤ـ هۆکـاری سیاسـی، کـە دروسـت بـوونو پێشـکەوتنی دەوڵـەتانی کۆمـەڵێك رێکەوتننامـەو پەیماننامـەو بەڵگەنامـەی لێکەوتـەوە دەربـارەی شـەڕو ئاشـتیوریزگرتنی کەرامـەتی مرۆڤایەتی.


منتدى إقرأ الثقافي

٥. هۆکاری یاسایی لە پێوەندی نێوان دەوڵەتان ویاسای نێو دەوڵەتان[٥].

بنەما ئیمپیرەتیڤەکانی یاسای نێو دەوڵەتان، پێوەندییان بە پاراستنی مافی مرۆڤ. بەتایبەتی مافی بوون و پەرەپێدانی ژیانی لە بارودۆخجاو. لە کاتێکیشدا کە کێشەی بەکۆمەڵ فەوتاندنی مرۆڤ دروست دەبێت. مرۆڤایەتی لە ئاستی پاراستنی پرنسیپی رەوشت لەنێوان دەوڵەتاندا پێویستە رابوەستێت[٦].

رۆژی ١٩٤٥/٨/٨ ئەمەریکا وسۆڤیەت و فەرەنسەو بەریتانیا و وڵاتانی تر رێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد بۆ پێکهێنانی دادگایەکی سەربازی، ئەوەبوو دادگای نورنبێرگ دروستبوو[٧].

تاوانەکانی نازیەکانی ئەڵمانیا لە وڵاتاندا لە جەنگی دووەمی جیهانیداو پێکهێنانی دادگای نورنبێرگ، بناغەیەکی باشیان لە یاسای نێودەوڵەتاندا دیاریکرد، تاکو تاوانبارانی جەنگ و تاوانی دژی مرۆڤایەتی دەرباز نەبن، بەتایبەتیش تاوانی جینۆساید وەکو تاوانێکی ترسناك لە مێژوی مرۆڤایەتیدا بایەخێکی باشی لە یاسای نێو دەوڵەتاندا پێدرا[٨].

رۆژی١٩٤٨/١٢/٩ لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەیماننامەی بەربەندکردنی جینۆسایدو سزاخستنە سەر تاوانکارانی جینۆساید بلاوکرایەوە. رۆژی دوای ئیمزاکردن لەسەر ئەو پەیماننامەیە، واتە لە ١٩٤٨/١٥/١٠دا هەر لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان جاڕی گەردوونی مافە مرۆڤ بلاوکرایەوە.

منتدى إقرأ الثقافي

بڵاوکردنەوەی دوو بەڵگەنامەی گرنگ یەك لە دوای یەك ئەوە دەگەیەنێت کە دەوڵەتانی دونیا بەهۆی کارەساتەکانی جەنگەوە چەند مەترسی یەخەی گرتوون وئاشتی وئاسایشی مرۆڤایەتی گەیشتۆتە ئاستێکی سەختو ئاڵۆز. پێویستە دان بەوەدا بنێین کە بایەخی بڵاوکردنەوەی پەیماننامەی تایبەت بە جینۆساید چەند پێویست بوو، هەروەها جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤیش پێویستی یەکی دیاربوو بۆ جێگیر کردن و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ.

جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ خەسڵەتی یاسایی ماف و ئازادیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ لە سەرداریێتی یاساوە گواستنەوە بۆ سەرداریێتی دەسەڵاتی(ماف)، واتە، پێویستە جێگیرکردن و ڕێزگرتنی ماف و ئازادیەکانی مرۆڤ لەسەروی یاساوەبن، هەروەکو لە پیچشەکیەکەی جاڕی گەردوونیدا رونکراوەتەوە کە پێویستەت پاراستنی کافەکانی مرۆڤ بەهۆی دادپەروەریەوە بێت تاکو مرۆڤ ناچاری یاخی بوون نەبێت[٩]. ئەمەش کاتێك سەردەگرێت کە سیستێمی دەسەڵات لەسەر بناغەیەکی دادپەروەرانە بنیات نرابێت.

کەباس لە ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ دەکەین لەعێراق،چ لەیاساو بڕیارە ڕەسمییەکانی ناوخۆو چ بەکردەوەش، سیاسەتی عێراق پێشلکاری و تاوانکارییەکی زەق و ترسناکی پێوە دیارە. لێرەدا، قسەمان لەسەر ڕەوشی مافی مرۆڤ نیە وەکو تاك لە عێراقدا، ئەگەرچی لەو بارەیەوە کەرامەتی مرۆڤ بە تەواویی


منتدى إقرأ الثقافي

پێشێلکراوە، بەڵکو قسەمان لەسەر پاراستنی مافەکانی گەلی کوردە لە عێراقدا.

بە گوێرەی هەلومەرجێکی جیهانی لە دوای جەنگی یەکەمەوە، باشووری کوردستان خرایە سەر دەوڵەتی تازەدروستکراوی عێراق. عێراقیش پاش ساڵانێك کە لەژێر ماندوێتی بەریتانیادا بوو، لە دەسەلاتی کۆلۆنیاڵی بەریتانی رزگاری بوو. ئەگەر لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە سەیربکەین، عێراق وەکو ئەندامێکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە چوارچێوەی پەیوەندی نێودەوڵەتیدا بەشداربووە لە ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتیدا بەشداربووە لە ژمارەیەکی زۆری بەڵگەنامەکانی یاسای نێو دەوڵەتاندا کە هەندێکیان وەکو نموونە ناو دەهێنین:

١. دەستووری رێکخراویUN، ساڵی ١٩٤٥.

٢. پەیماننامەی بەربەندکردنی جینۆسایدو سزا خستنە سەر تاوانکارانی جینۆساید، ساڵی ١٩٤٨.

٣. جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ ساڵی ١٩٤٨.

٤- رێکەوتننامەکانی ژنێڤ تایبەت بە بەجەنگو پاراستنی خەڵکی مەدەنی، ساڵی ١٩٤٩ لەگەڵ هەردوو برۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٧٧.

٥- پەیمانی تایبەت بە مافی مەدەنیو سیاسیو لەگەڵ پەیمانی تایبەت بەمافی ئابووریو کولتووریو کۆمەڵایەتی ساڵی١٩٦٦لەگەڵ پاشبەندێك.



منتدى إقرأ الثقافي

سەرجەم ئەو بەڵگەنامانە وەکو ڕێکەوتننامەی گرنگی نێوان دەوڵەتانی دونیا کە زۆرترین ژمارەی دەوڵەتان بەشدارییان تێیاندا کردوە، تێکڕای مرۆڤایەتی دەگرنەوەو پێوەندییان بە بوون و کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە لە دونیادا لە کاتی شەڕو ئاشتیدا، پێوەندییان بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤەوە هەیە چ وەك(تاك) یاوەك(کۆمەڵ) کە میللەتان و گەلانی دونیا دەگرێتەوە.

ئەو بەڵگەنامانە، کە لەبەرئەوەی لە شێوەی پەیماننامەی دروستکەری(بنەمای یاسایی-قواعد قانونیە)دا پێکهاتوون، دەبنە ئەو بنەمایانەی لەو سەرچاوانەدا پێکهاتوون بنەمای ئیمپرەتیڤن و خۆیان دەسەپێنن بەسەر سەرجەم دەوڵەتانی دونیادا.

لەم قۆناغەی کە مرۆڤایەتی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرزوپێکەوتوو لەسەدەی بیست و یەکەمدا، مایەی داخ و نائومێدیە کەجێبەجێکردن و کارپێکردنی ئەو سەرچاوانەی یاسای نێودەوڵەتان لەنێوان بەرژەوەندیی و هێزدا پێشێل دەکرێن وپاراستنی مافەکانی گەلێکی وەکو کورد ئاوڕی لێنادرێتەوە.

ئەگەر ئێمە گەلی کورد خۆی بە پلەی یەکەم لەو بارەیەوە بەرپرسیاربکەین کە نەیتوانیوە(یا بۆی نەڕەخساوە) دەسەڵاتێکی سیاسی هەبێت و داکۆکی لە مافەکانی بکات ئەویش بەهۆی هەلومەرجی دەرەکی وناوەکیەوە، بەڵام بە ئەندازەیەکی زۆر


منتدى إقرأ الثقافي

بەرپرسیاریێتی دەکەوێتە ئەستۆی عێراق و دەوڵەتانی دەوروبەروسیاسەتی نێودەوڵەتان لە جیهاندا.

دیارە کارێکی ئاسان نیە کە بەوردی رووداوەکانی سیاسەتی رۆژانەی عێراق لە ئاستی گەلی کوردا بخوێنینەوەو بەڵگەنامەکان لەگەڵ رووداوەکان ناوخۆدا تاووتوێ بکەین. ئەوسیاسەتەش کارەساتێکی وای بەسەر کوردا هێناوە، سەرجەم بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە. ئەو رووداوانەی کە لە ئەنجامی سیاسەتی عێراقەوە روویانداوە، ئاسەوارێکی ترسناك و دوور مەوداویان بەسەربوون و ژیانی گەلی کوردەوە جێ هێشتووە.

ئەگەر خەسڵەتی بنەما ئیمپیرەتیفەکانی یاسای نێودەوڵەتان داسەپاندنی بێت بەسەر دەوڵەتانی دونیادا، ئەواسیاسەتی عێراق لە ئاستی گەلی کورددا دەکەوێتە بەر بەرپرسیارێتی تاوانی نێو نەتەوەیی و پێشێلکردنی سەرجەم ئەو پابەندێتیانەی کە عێراق وەکو دەوڵەتێك هەیەتی لەدونیادا.

عێراق بەحوکمی ئەوەی ئەندامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە چ بە گوێرەی دەستوری ئەو رێکخراوەو چ بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی تری یاسای نێودەوڵەتان، بەتایبەتیش پەیماننامەی تایبەت بە جینۆسایدو جاڕی گەردوونیی و رێکەوتننامەکانی ژنێڤ ساڵی ١٩٤٩و هەردوو پەیمانی ساڵی ١٩٦٦، لەسەریەتی لەیاسای ناوخۆی خۆیدا بنەماوپرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتان جێگیربکات و بەدەقی یاسایی تاوانەکانی جەنگ و تاوانی جینۆسایدو هەموو ئەو



منتدى إقرأ الثقافي

تاوانانەی کە لەدژی مرۆڤایەتین دیاریی بکاتو سزا بخاتە سەر تاوانکارانی ئەو تاوانانە. ئەگەر وانەکات بەرپرسیار دەبێت بەرانبەر یاسای نێو دەوڵەتان. بەڵام دەستوری دادگای نورنبێرگ ئەوەی دیاریکردوە کە(دادگای نێو دەوڵەتان) پێویستی بە یاسای ناوخۆی وڵاتان نیە تا حوکم بەسەر تاوانبارانی جەنگدا بدات، چونکە یاسای نێودەوڵەتان خۆی بەسە بۆ حوکمدان بەسەر ئەوەدا[١٠]، کەواتە، بوونی کۆمەڵێك بڕیارو مەرسووم لەناوخۆی عێراقدا کە حوکمی قانونیان هەیە، لەلایەکی دیکەوە رەفتاری رۆژانەی دەزگاکانی عێراق، کەسیاسەتی حکومەتیان پێ جێبەجێدەکرێت. لە رویەکەوە ناکۆکی لەگەڵ بنەما ئیمپیرەتیڤەکانی یاسای نێو دەوڵەتاندا دروست دەکات، لە روویەکی دیکەوە لە دژی ئەو خەسڵەتە باڵایەیە کە دەوڵەتان ناچار دەکات پێوەی پابەندبن.

ئەو سیاسەتەی کە عێراق رەفتاری پێدەکات لەدژی گەلی کورد، بەتەواویی وەکو سیاسەتی جینۆساید دیاریدەکرێت، ئەگەر بەوردی سەیری هێرشەکانی ئەنفالەکان بکەین. دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ سەر دەمانێکی پێش دەستپێکردنی ئەو هێرشانەوسیاسەتی عێراق وابخوێنینەوە کە ئەنفال قۆناغێکە لە سیاسەتێك پێشتر پەیرەوکراوەو پلانو نەخشەی بۆ کێشراوە[١١].

بۆیە، دەتوانین بڵێین کە هێشەکانی ئەنفالەکان بەشێك یا قۆناغێك بوو لە سیاسەتی جینۆساید، چونکە سەرجەمی


منتدى إقرأ الثقافي

تاوانەکانی لە چوارچێوەی سیاسەتێکدا ئەنجامدران کە توانایەکی زۆری بەبەرنامەو پلان بۆ تەرخانکرابوو. بە حوکمی بڕیارو مەرسومەکانی ناوخۆی عێراق و بەکردەوەش تاوان لە دژی گەلی کورد وەکو کارێکی رەواو قانونی ئەنجامدەدرا.

کوشتن(بەتاك وبەکۆمەڵ)وێرانکردن، دەرکردن، دەست بەسەراگرتنی ماڵ و موڵك، زیندانیکردن. بە زۆر راگواستن، شێواندن وتێکدانی ژیانی ئاسایی خەڵکی، بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و سوپایەکی بەتواناو مۆدێرن، ئەم کارانە ئاسەوارێکی زۆر ترسناکیان لەسەر سەرجەم بوارەکانی ژیان لە کوردستاندا جێهێشت بەتایبەتیش سڕینەوەی مافی ژیان بۆ مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێك و شێواندن و تێکدانی ژینگەش.

سیاسەتی جینۆساید کارێك نیە لە پڕو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ئەنجام بدریٚ و کۆتایی بێت، بەڵکو پێشترو بەتەواوی هۆشیاری و ئاگاوە بەمەبەستێکی دوور خایانەن ئەنجام دەدرێت. لێرەوە، دەڵێین کە سیاسەتی عێراق لە دژی گەلی کورد جینۆسایدە.

یەکمجار زانای بە رەگەز پۆڵۆنیهەڵگری ناسنامەی ئەمەریکی R. Lemkin زاراوەی Genocideی بەکارهێنا. ر.لیمکین، خۆی راوێژکاری وەزارەتی جەنگ بوو لە ئەمەریکا. بنەماڵکەیان لە جەنگی دووەمدا بەدەستی نازیەکان هەموویان قڕکران چونکە جولەکە بوون. بە گوێرەی بیروڕای لیمکین تاوانی جینۆساید، کۆمەڵە کارێکە بەمەبەستی وێرانکردنی زەمینەی سەرەکی ژیانی



منتدى إقرأ الثقافي

کۆمــەڵ مرۆڤێــك، تــاکو قەلاچـۆ بکرێــت، ئــەویش بــە دارمــان و وێرانکردنـــی پێکهاتـــەی سیاســـی، کۆمەڵایـــەتی، کولتـــووری و زمانــەوانی و تێکــدانی هەســت و ســۆزی نیشــتیمانی و ئــایینی و ئــابوری. ئــەو کارانــەش لــە دژی تاکــە کەســانە نــەك وەکــو (تــاك)، بــەڵکو لەبەرئــەوەی ســەر بــە کۆمەڵــە مرۆڤێکــی دیــاریکراون. هــەروەها لــیمکین بــڕوای وایــە ئــەو تاوانــە بــە دوو قۆنــاغ ئــەنجام دەدرێت:

**قۆناغی یەکەم**: وێرانکردنی چوار چێوەو قەبارەی نیشتیمانی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەی لە ژێر چەوساندنەوە دان.

**قۆناغی دووەم**: گۆڕینی ئەو چوار چێوەو قەبارەی نیشتیمانیە وێرانکراوە بەو سستمەی کە ئەنجامدەرانی تاوانەکە دەیسەپێنن.

لیمکین بڕوای وایە کە لە قۆناغی یەکەمدا وێرانکردنە کە ئەم بوارانــە دەگرێتــەوە: پێکهاتــەی سیاســی،کۆمەڵایەتی، ئــابووری و بیۆلۆژی. هەروەها شێواندنی دەروونـی و قەناعـەتی مـرۆڤ بەهۆی چــاپەمەنی و بڵاوکــراوەی خــراپ و برەوپێــدانی خواردنــەوە و ناچارکردنی ئافرەتان بە داوێن پیسی.

بەڵام بیروڕای لیمکین دەربارەی قۆناغی دووەم ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵە مرۆڤە کەسایەتی تایبەتیان نەمێنێ وبتوێنەوە[١٢].

لەبــەر رۆشــنایی بــیروڕای(لــیمکین)دا دەتــوانین سیاســەتی حکومــەتی عێــراق بــە تــاوانی جینۆســاید دیــاری بکــەین. جینۆســایدیش سیاســەتێکی درێژخایەنــە بــۆ ئەنجامــدانی تــاوانێکی درێژخایــەن. رەنگــە بــە ئــامرازی شــەڕوتەرخانکردنی


منتدى إقرأ الثقافي

سوپا ئەو سیاسەتە ئەنجام بدرێ و رەنگیشە وەکو سیاسەتێکی جیاواز بەبێ کەرەسەو ئامرازی جەنگ ئەنجام بدرێ، بەڵام تواناو بەرنامەی دیاریکراوی بۆ دابنرێت. هەر بۆیە پەیماننامەیساڵی ١٩٤٨ دەربارەی بەربەنکردنی جینۆسایدوسزاخستنە سەر تاوانکارانی لەبەندی یەکەمدا دەڵێ:(لایەنە بەشداربووەکان، جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە جینۆساید ئەگەر لەسەردەمی شەڕدا یا لە سەردەمی ئاشتیدا ئەنجام بدرێ، بە گوێرەی یاسای نێودەوڵەتان تاوانەو پەیمان دەدەن کە قەدەغەی بکەن و سزای بخەنە سەر)[١٣].

دیارە بە گوێرەی ئەم بەندە جینۆساید لە تاوانی دیکە جیا دەکرێتەوە کەرەنگە شەڕ لە ئارادا نەبێت بەڵام جینۆساید هەبێت.

کەواتە فەوتاندنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك چ راستەوخۆ یا لەرەگ وریشە هەلچکەندنیان بە شێوەو رێبازی جیاجیا یا بە ئامرازو نەخشەو پلانی هەمەجۆر، هەر پێی دەوترێت جینۆساید. بۆیە دەتوانین جگە لەو کوشتاروتاوانانەی کە حکومەتی عێراق لە پێش ئەنفالەکان و لەسەردەمی ئەنفالەکان و پاشتر، هەتاکو ئەم سەردەمەش سیاسەتی جینۆساید هەر بەردەوامە.

ئەگەر سەیری ئەو بەڵگەنامە رەسمیانە بکەین کە حکومەتی عێراق(بەنهێنی)لە نێوان دەزگاکانی ناوخۆی عێراقدا کاری پێکردووە بۆ دەرکردنی کورد لە شاری کەرکووك وخانەقسن و


منتدى إقرأ الثقافي

ناوچەکانی ترو دەست بەسەراگرتنی کاڵو موڵکیان، یا گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییان لە کوردەوە بۆ عەرەب، ئەمانە درێژە پێدان و بەردەوامی سیاسەتی جینۆسایدن.

لێرە ئامێرێك بڵاودەکەینەوە کە لەدەزگایەکی رەسمی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دەرچووە، ئویش(بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی)یە. سەرنج بدەنە ئەم ئامارەو وەکو تاکە نموونەیەك، ئەوسا دەزانین ئەو کاولکارییە بەسەر کوردستاندا هاتووە چەند بەرفراوان و ترسناکە، ئەمە تەنها ئەو ناوچانەی پارێزگای سلێمانی دەگرێتەوە کە ئێستا لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانداندان. ئەگەر سەیری ناوچەکانی تری کوردستان بکەین بەهەمان شێوە حکومەتی عێراق وێرانکاریی کردووە.

ئەمە وەکو بەڵگەیەکی رەسمی بۆ پاڵپشتی ئەو بیروباوەڕانەی لەم باسەماندا هاتوون.

پاشبەند/ئاماری بەڕێوەبەرایەتی سلێمانی بروانە لاپەڕە (١٠٨- ١١٥).


منتدى إقرأ الثقافي

## سەرچاوەو پەراوێز/

١ــ پێمــان باشــە بــە(میثــاق الأمــم المتحــدة)بڵــێین(دەســتوری نەتــەوە یەکگرتووەکان)، چونکە وەکو دەستور کاری پێدەکریّو پێویستە دەوڵەتان ڕێزی لێبگرن.

٢. عبدالباقی البکری، الدکتۆر علی محمد بدیروزهیر البشیر. المدخل لدراسة القانون، بغداد، ١٩٨٢ص٢٤٣،

هــەروەها: الــدکتور أنــور ســلطان، المبــادیء القانونیــة، طبعــة رابعــة، بیروت،١٩٨٣ص٥١-٥٢.

٣ـ الـدکتور حسـن کیره: المـدخل الی القـانون، الطبعـة السادسـة الأسـکندریة، ١٩٩٣ص٤٣.

٤ـ الـدکتۆر محمـد عزیـز شـکری: الـوجیز في القـانون الـدولي العـام. منشـورات جامعة دمشق، ١٩٩٧ص١٣٦.

٥ـ عبـدالله عبـدالجلیل الحـدیثي: النظریـة العامـة في القواعـد الآمـرة في القـانون الدولي،الطبعة الأولی، بغداد١٩٨٦ص٤٨.

٦ـ الـدکتور أحسـان هنـدی: مبـادیء القـانون الـدولي العـام في السـلم والحـرب، الطبعة الأولی، دار الجیل، دمشق ١٩٨٤ص١٢٢.

٧. الـدکتور محمـد سـلیم محمـد غـزوي: جریمـة إبـادة الجـنس البشـري، طبیعـة ثانیة، الاسکندریة١٩٨٢ص٤٨.

٨ـ دەربـارەی تـاوانی جینۆسـاید، بڕوانـە کتێبێکـی تایبـەتمان لـەو بارەیـەوە: جینۆسـایدی گـەلی کـورد لەبـەر ڕۆشـنایی یاسـای تـازەی نێـو دەوڵەتانـدا، چـاپی یەکەم. لە بڵاوکراوەکانی یانەی کوردی میدیا، ئومستەردام ١٩٩٧.

٩ــ صــلاح الــدین حــافظ: أحــزان حریــة الصــحافة، الطبعــة الأولی، القاهرة١٩٩٦ص٣٩.

١٠ـ الـدکتور محمـد عزیـز شـکري: مـدخل الی القـانون الـدولي العـام، الطبعـة السابعة، منشورات جامعة دمشق،١٩٩٨ص٦١٦.

١١. بۆ ئەوەی زیاتر بۆمان روون بێتەوە، کە ئەنفال قۆناغێك بووە لـە سیاسـەتی جینۆساید، بڕوانـە/ مارف گـوڵ، ئـەنفال قۆناغێکـە لـە پراکتیککردنـی جینۆسـاید، سلێمانی ٢٠٠٠.

١٢ـ الـدکتور عبـدالوهاب حومـد: الأجـرام الـدولي، الطبعـة الأولی، مطبوعـات جامعة الکویت، ١٩٧٨ص٢٣٨-٢٣٩.

١٣ـ اتفاقیة منع جریمة أبادة الجنس البشري وأنزال العقوبة بمرتکبها لعام ١٩٤٨.

١٤ــ ئامارێـك کـە لـە بەڕێوەبەرایـەتی ئامـاری سـلێمانی وەرگـیراوە، بـەو وێرانکاریانەی کە ڕژێمی عێراق لە ناوچەکانی سەربە سلێمانی کردوونی.

منتدى إقرأ الثقافي

## بابەتی سێیەم

# پێکهاتنی یاسای نێودەوڵەتان و پێوەندیی بە یاسای ناوخۆی دەوڵەتەوە

### پێشەکی

یاسای نێودەوڵەتان و یاسای ناوخۆی دەوڵەت پێوەندییەکی دیاریان بەیەکەوە هەیە، بەو جۆرەی کە هەریەك لەو دوو لایەنە رۆڵیان دیارە لە پێکهاتن و پێشکەوتنی یەکدیدا.

دیارە بۆ دیاریکردنی ئەو پێوەندییە پێویستمان بەوە هەیە بزانین یاسای نێودەوڵەتان چییەو لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو پێناسەو سەرچاوەیەش چۆن بوونە بەمایەی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی یاسای نێودەوڵەتان.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە پاش زانینی ئەو لایەنانە بزانین رۆڵی یاسای نێودەوڵەتان چییە لە دروستکردنی پابەندێتی نێو نەتەوەیی و قورسایی لەسەر یاسای ناوخۆی دەوڵەت، وەکو

منتدى إقرأ الثقافي

هەڵوێستی دەوڵەت لەڕوی تیۆریی و پراکتیکەوە لە ئاستی یاسای نێودەوڵەتاندا.

بۆیە بایەخی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەوەدایە کە دەمانخاتە بەردەم دۆخێکی وا تاکو لەڕوانگەو لەبەر رۆشنایی یاسای نێودەوڵەتاندا ئەرکی دەوڵەت لە رێزگرتنی مافی مرۆڤدا دیاریبکەین.

بۆ لێك جوداکردنەوەی بابەتەکانی لێکۆڵینەوەکەو دیاریکردنی هێڵە هاوبەشەکانی بە چاکمان زانی باسەکە بەم جۆرە دابەش بکەین:

بەشی یەکەم : مانای یاسای نێودەوڵەتان.

بەشی دووەم: سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتان.

بەشی سێیەم: سەرهەڵدان و پێکهاتنی یاسای نێودەوڵەتان.

بەشی چوارەم: هەندێ لایەنی پەیوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتان و یاسای ناوخۆی دەوڵەت.

منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی یەکەم

# مانای یاسای نێودەوڵەتان

کە دەڵێین یاسای نێودەوڵەتان، مەبەستمان یاسای گشتی نێودەوڵەتانە LA DROIT INTERNATIONAL PUBLIC، بۆ ئەوەی جیای بکەینەوە لەگەڵ یاسای تایبەتی نێودەوڵەتاندا LE DROIT INTERNATIONAL PRIVE.

یاسای نێودەوڵەتات کۆمەڵێك بنەمایە کە سیستمێکی یاسایی دروست دەکات لەنێوان دەوڵەتاندا. هەر دەوڵەتێك لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییانەدا مافەکانی خۆی دەپارێزێ و ئەرکیشی دەکەوێتە ئەستۆ[1]. بەلام یاسای تایبەتی نێوان دەوڵەتان پەیوەندییەکانی ناوخۆی دەوڵەت رێکدەخات، چ لەئاستی هاولاتیان یا کەسانی ئاسایی و کەسانی رەسمی (فەرمانبەران و کاربەدەستان) دەگرێتەوە لەگەڵ دەزگاکانی ناوخۆی دەوڵەتدا. بەلام کەسانی یاسای نێودەوڵەتان بریتین لە: دەوڵەتان، رێکخراوەکانی نێوان دەوڵەتان، نوێنەرایەتی گەلانی


منتدى إقرأ الثقافي

ئازادیخواز کە خەبات دەکەن بۆ رزگاری و کەسانی تری یاسای نێودەوڵەتان[٢].

بۆ پیاسەکردنی یاسای نێودەوڵەتان سێ رێبازی جیاواز هەیە:

•**رێبازی یەکەم:** تەنها دەوڵەتان بەکەسانی یاسای نێودەوڵەتان دادەنێت و پێناسەکەشی وادەکات: کۆمەڵێك بنەمای یاساییە پەیوەندی نێوان تەنها دەوڵەتان رێك دەخات.

•**رێبازی دووەم:** تەنها (تاکەکەس) بە کەسانی یاسای نێودەوڵەتان دادەنێت، پێناسەکەیشی وادەکات کە: بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان پەیوەندی نێوان(تاکەکەسەکان)رێکدەخات.

•**رێبازی سێیەم:** دەوڵەت بەلایەنی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتان دادەنێت، بەلام یاسای نێودەوڵەتان کۆمەڵێك بنەمایە کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان و کەسانی تری یاسای نێودەوڵەتان رێکدەخات وەکو رێکخراوەکانی نێوان نێودەوڵەتان، فاتیکان و کەسانی تری یاسای نێودەوڵەتان[٣].

کەواتە، یاسای نێوان دەوڵەتان وا پێناسە دەکرێت کە پەیوەندیی نێوان لایەنەکانی رێکدەخاتە. بۆیە ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەگەرچی دەوڵەتان لایەنی سەرەکین لە یاسای نیودەوڵەتاندا. بەلام بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان لەکۆی

منتدى إقرأ الثقافي

سەرجەم پەیوەندییەکانی نێوان لایەنەکانی یاسای نێودەوڵەتانەوە پێك دێن.

هەندێ جار بەیاسای نێودەوڵەتان دەوترێت یاسای نێونەتەوەیی، ئەگەرچی سیستمی یاسایی ئەو پەیوەندییە لەنێوان دەوڵەتاندایە. بەڵام لەبەر ئەوەی هەردەوڵەتێك بە ناوی نەتەوەکانی ناوخۆی خۆیەوە لە کاردایە، هەتا ئێستاش ئەو ناوە یەکلایی نەکراوەتەوە. دیاوە زۆرجار دەوڵەت سیاسەتی خۆی واپیادە دەکات کە بەشێوەیەکی گونجاو بەرژەوەندیو پێشکەوتنی گەلانی ناوخۆی دەوڵەت رێزی لێناگیرێت، بۆیە وتراوە: یاسای نێودەوڵەتان.

هەر دەوڵەتێك لە چوارچێوەی سیستمی یاسایی نێودەوڵەتیدا دەبێتەلایەنێك(سوبێکت-subject)لە یاسای نێودەوڵەتاندا.

یاسای نێودەوڵەتان، ئەگەرچی سیستمی یاسایی نێوان دەوڵەتانی دونیایە، بەلام رێکخەری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییە، کە پێکهاتووە لە: دەوڵەتان، رێکخراوی جیهانی رەسمی(حکومی)و بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلان[٤]. سەرجەم ئەمانەش پەیوەندن بە ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە. کەواتە ئەو سیستێمی پەیوەندییەی کە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی رێکدەخاتو مافو ئەرك دیاری دەکات، وەکو قانوونی نێونەتەوەیش دەناسرێت.

هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێین کە بنەماو چوارچێوەی قانونەکانی دونیا لە خزمەتی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدان، ئەگەرچی سیاسەتو بەرژەوەندیی زلهێزو دەوڵەتانی تری دونیا دەوریان


منتدى إقرأ الثقافي

هەیە لە داڕشتن و ڕێکخستنی سیستەمی پەیوەندی نێوان دەوڵەتاندا بەگشتی، بەڵام خەبات و هەوڵی ڕێکخراوە مرۆدۆستەکان و گەلانی ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم و گەلانی خەباتگێڕ لە پێناوی ئازادیدا، گۆڕان و سیستەمی تازە بە بەردەوامی لەیاسای نێودەوڵەتاندا دروست دەکەن.

سیستیمی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان جیاوازیی هەیە لەگەڵ سیستەمی پەیوەندی ناوخۆی دەوڵەتدا، یاسای گشتی نێودەوڵەتان سیستەمی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان ڕێکدەخات، بەڵام ناوخۆی دەوڵەت پەیوەندی نێوان ئۆرگانەکانی ناوخۆو دانیشتوانی ولات ڕێکدەخات(٥).

شارل روسو لای وایە لە بارترین ناو بۆ یاسای نێودەوڵەتی، لەبەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان ڕێك دەخات، ئەوەیە بووترێت: ( یاسای نێوان دەوڵەتان)بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکی لەسەر بەکارهێنانی وا راهاتوون دەکرێ بووترێت یاسای نێودەوڵەتیی droitinternational(٦).

لە ئەنجامدا دەڵێین: ئەو بنەماو چوارچێوە یاساییانەی پەیوەندیی نێوان دەوڵەت ڕێکدەخەن ئەگەر لە بەرژەوەندیی گەلانی ناوخۆی دەوڵەتەکاندابن، یان لەهەندێجاردا لە بەرژەوەندییاندا نەبن، لەبەر ئەوەی دەوڵەتان ئەو کاروبارە ئەنجام دەدەن، چاکترە بڵێین: یاسای نێوان دەوڵەتان، بەڵام بۆ سووککردنی لە ڕوی فۆنەتیکەوە ڕەوانتردێت ئەگەر بڵێین(یاسای نێودەوڵەتان).

منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی دووەم

# سەرچاوەکانی یاسای نێودەوڵەتان

**یەکەم: سەرچاوەی سەرەکی**

**دووەم: سەرچاوەی لاوەکی( یارمەتیدەر)**

**یەکەم: سەرچاوە سەرەکییەکان:**

**LES SOURCES PRINCIP ALES**

١. داب و نەریت.

٢پەیماننامە.

٣. پرینسیپە گشتییەکانی یاسا.



منتدى إقرأ الثقافي

## ١ـ دابونەریت:

LA COUTUME INTERNATIONAL-INTERNATIOAL CUSTOM کۆمەڵێك بنەمای یاسایی نەنووسراوە( REGLE DE DROIT)، لەئەنجامی زۆر بەکارهێنانی لەلایەن دەوڵەتانەوە پەیدابووە. یا ئەگەر دەوڵەتێك کارێکی کردبێ و پاشتر هەر ئەو دەوڵەتە یا دەوڵەتانی تر پیادەی بکەن و لەسەری بڕۆن، لە ئەنجامدا بە پێویستی بزانن خۆیانی پێوەپابەند بکەن. هەر دەوڵەتێك لە رۆژی پەیدابوونیەوە وەکو ئەندامێکی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی، ئیتر پابەند دەبێت بە رێزگرتنی دابونەریتی نێونەتەوەیی لە یاسای نێودەوڵەتاندا(٧).

دابونەریت بایەخێکی دیاری هەیە وەکو سەرچاوەیەکی یاسای نێودەوڵەتان، چونکە:

١ـ زۆربەی بنەماکانی نێوان دەوڵەتان(قواعد دولیە)لەداب و نەریتەوە پەیدا بوون. وەکو ئەو بنەما یاساییانەی کە تایبەتن بەدەریاو بە پەیوەندی دیبلۆماسیەوە.

٢ـ ئەگەرچی پەیماننامە بووە بەسەرچاوە بۆ یاسای نێودەوڵەتان بەلام دابونەریت بایەخی خۆی لە دەست نەداوە(٨).

دابونەریت سەرجەم یاسای نیودەوڵەتانی هێنایە روو، هەروەها لەزۆر باردا ئەو بنەمایانەی کە لەرێکەوتننامەکاندا دەبنە هۆی پێکهێنانی یاسا، دارشتنەوەی ئەو دابونەریتانەن، کە لە نێوان دەوڵەتدا جێگیربوون و کاریان پێدەکرێت(٩).



منتدى إقرأ الثقافي

ئاشـــكرایه پەیوەنـــدیی نێودەوڵـــەتان كـــاری هەیـــه لـــه ســـەر سەرچاوەكانی یاسا، جا لەبەر ئەوەی داب‌ونەریت نەنووسراوەو نادیاره بەگوێرەی پێشكەوتن‌و گۆڕانی نێودەوڵەتی گۆڕانكاری بەسەردا دێت، لـه چوارچێوەی پەیماننامـەی نێـوان دەوڵەتانـدا بـــەهۆی رێكخـــراوی نێودەوڵەتییـــەوه ئەوبنـــەما عورفیانـــه جێگیركراون[١٠].

## ٢ـ پەیماننامه : LES TRAITES

رێكەوتنی قانوونیانه بەشێوەیەكی رەسمی لەنێوان دوولایەن یـان زیـاتر لـه كەسـانی یاسـای نێودەوڵـەتان، بـه مەبەسـتی پێكهێنـانی ماف‌وئـەرك بـۆ لایەنـەكانی، بەشـێوەیەكی ئـارەزوو مەندانه چوارچێوەی پەیماننامه رێكدەخات.

مەرجی سەرەكیش بۆ پەیماننامه ئەوەیه، پێویسته بەنێوانی كەســانی یاســای نێودەوڵەتانــدا بێــت(دەوڵــەتان، رێكخــراوه نیچودەوڵەتییەكان‌و رێكخراوەكـانی بزوتنـەوەی رزگـاری گـەلان‌و كەسانی تری یاسای نێوان دەوڵەتان[١١].

پەیماننامه دەبێته هۆی پێكهێنانی بنەمای یاسایی له یاسای نێودەوڵەتانـدا، هـەروەكو چـۆن دەسـەڵاتی یاسـادانان لـەناوخۆی وولاتدا یاسا دادەنێت، بەو جۆرەش پەیماننامه رۆڵـی یاسادانان دەبێت[١٢].



منتدى إقرأ الثقافي

ڕێکەوتننامەی ڤیەننا دەربارەی یاسای پەیماننامەن لەساڵی ١٩٦٩دا، بنەما عورفییەکانی یاسای نێودەوڵەتانی خستە چوارچێوەی تێکستی قانونیەوە[١٣].

## ٣- پرنسیپەگشتییەکانی یاسا:

LES PRINCEIPES GENERAUX DE DROIT-
GENERAL PRINCIPLES OF LAW

ئەو کۆمەڵە پرینسیپە قانونیانەی کە کۆمەڵگەی شارستانی لە جیهاندا دانی پیادا ناوەو پێویستە لەیاساکانی ناوخۆی وولاتاندا پەیرەوبکرێت. وەکو پرینسیپی سەرەکی سەرجەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. وەکو پرینسیپەکانی سەرجەم یاساکانی ناوخۆ، بنەماکانی ڕێو ڕەسمی داخوازیکردن و بەڵگەی ئیسپاتکردن، هەروەها پرینسیپەکانی سیستێمی نێو دەوڵەتی، وەکو سەرخستنی یاسای نێودەوڵەتان بەسەر یاسای ناخۆوبەردەوام بوونی دەوڵەت لەدوای گۆڕانی حکومەت و پارێزگاری و داب ورەسمی دیپلۆماسی[١٤].

زانایان پرینسیپە گشتییەکانی یاسا بەوە دیاری دەکەن کە مەبەست لەوە ئەو پرینسیپە بنەڕەتیانەیە کە یاساکانی ناوخۆی ولاتاندا هەن[١٥].


منتدى إقرأ الثقافي

## دووەم: سەرچاوە لاوەکییەکان یان

(سەرچاوەی یارمەتیدەر)LES SOURCES AUXILIARES

وەکو لەبەندی(٣٨)ی دەستوری دادگای دادی نێودەوڵەتیدا دیاریکراوە، کە دادگاکە سەرباری سەرچاوە سەرەکییەکانی یاسای نێودەوڵەتان دەتوانێت پشت بە بڕیاری دادگاکانو تێڕوانینی قانوون ناسانی میللەتانی دونیا ببەستێت بۆ دیاریکردنی بڕیارو بنەمای قانوونی. کەواتە، سەرچاوە یارمەتیدەرەکانی یاسای نێودەوڵەتان بریتیین لە:

١. بڕیاری دادگای دادی نێودەوڵەتان سەربە.UN

٢. تێڕوانینوبیروڕای قانوون ناسانی میللەتانی دونیا.

٣. بڕیارەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، لە جۆری UN .

٤. قانونی ناوخۆی ولاتان(١٦).


منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی سێیەم

# سەرهەڵدان و پێکهاتنی یاسای نێودەوڵەتان

سەرهەڵدان و پەیدابوونی قانوونی نێودەوڵەتان بەستراوە بە سەرهەڵدانی دەوڵەتانەوە، کەواتە دەوڵەت لە سەرەتاوە قانوونی ناوخۆی هەبووە بۆ ڕێکخستنی کاروباری و بۆ گونجاندنی جۆری دەسەڵات بەسەر هاووڵاتیان و پەیوەندیی نێوان هاووڵاتیان و ئۆرگانەکانی ناوخۆی. هەر بۆیەش قانوونی نێودەوڵەتان وەکو پێویست بۆ پێکهێنانی پەیوەندی نێوان وولاتان هاتۆتە کایەوە. کەواتە، قانونی نێودەوڵەتان لەسەرەتاوە سوودی لە قانوونی ناوخۆی دەوڵەت وەرگرتووە(١٧).

لەسەدەکانی(١٥،١٦)دا بە هۆی ڕووداوو پێشکەوتنە گرنکەکانی ئەوروپاوە، لە سەرجەم ژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئایینی، زانستی و کولتووریدا گۆڕان دروست بووە، ئەو پێشکەوتنەش بووە هۆی پێشکەوتن و ڕەنگ ڕشتنی چوار



منتدى إقرأ الثقافي

چـێوەیەکی قـانوونی لـەنێوان دەوڵەتانـداو قـانوونی گشـتی نێودەوڵەتان گەشەیکرد.

## ئەوفاکتەرانەی کـە بوونـە هـۆی پێشـکەوتن و زیـاتر کـامڵ بوونی نێودەوڵەتـان ئەمانە بوون:

### ١- ڕێنیسانس La Renaissance "النهضه العمیه" :

پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی، زانستی و ڕۆڵی زانکۆکانی ئەوروپا جێگەیـەکی دیاریـان هەیـە لـە پێکهێنـانی بنـەماکانی قـانوونی نێودەوڵەتـدا، چـونکە لـە سـەدەی پـازدەو بـەداواوە کۆمـەڵێك شـارەزاو پسـپۆری کلاسـیکی لـەبواری قـانوونی نێـو دەوڵەتانـدا دەرکـەوتن کـە ئەوانـە بـە پێشـڕەوانی قـانونی نێـو دەوڵـەتان ناسراون[١٨].

### ٢- پێکهاتنی دەوڵەتانی ناسیۆناڵ:

پێشـکەوتنی دەوڵـەتانی ئـەوروپا گەیشـتە ئـەو قۆناغـەی کـە دەسەڵاتی ئاینی مەسیحی و سەرداریێتی کلیساکان کـەم بێتـەوەو پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان لەسەر بناغەی پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەشـیان، کـارێکی وایکـرد، سـەردەمی دەرەبەگایـەتی خۆیـدا لەکزی و هەرەسی هێنا. ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد کە پەیوەندیی نێـوان وڵاتـانی ئـەوروپا پایـەی دەوڵەتـەکانی لەسـەر بناغەیـەکی نەتـەوەیی دارشت وپاشـای دەوڵەتـەکانیان خۆیـان لـە دەسـەڵاتی کلیسـاکان دابـڕی. ئـەم گۆڕانـە بـووە هـۆی پەیـدابوونی گـەلێ دەوڵەتی تازە لـە ئـەوروپا لەسـەر بناغـەی نەتـەوەیی. بزوتنـەوەی


منتدى إقرأ الثقافي

ریفۆرمی ئاینیش کارێکی وایکرد هەستی نەتەوایەتی زیادیکردو زمانی نەتەوەیی بووبە زمانی نوێژکردنیش، لە جێگەی زمانی لاتینی کە زمانحاڵی رەسمی کلیساکان بووو.

بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بووە هۆی سەرهەڵدانی بنەماکانی قانوونی نێودەوڵەتان، ئەویش بەهۆی ئەو جەنگ و پێکدانانەی کە گەیشتە رێکەوتنی «ئۆگسبورگ» لەساڵی(١٥٥٥)دا. ئەو رێکەوتنە پرنسیپی (هەر کەسو لەسەر ئاینی پاشای خۆی) داهێناو بووە هۆی دان پێدانان بە(٣٥٠) دەوڵەتدا، کەسەرجەمیان لەسەر خاکی ئەڵمانیا بوون.

ئەم دەوڵەتانەش لەنێوان خۆیانداو لەگەڵ دەوڵەتانی تردا کەوتنە پەیوەندی و رێکەوتن لەسەر چوارچێوەوشێوەی رێکخستنی نێوانیان، ئیتر ئەو جۆری پەیوەندییانەش سەرەتایەکی قانوونی لە گشتی نێوان وڵاتاندا دروستکردو رۆژگاری ئیمڕۆش لە پەرەسەندندایە[٢٠].

٣- پێشکەوتنی زانستی جوگرافی ودەریایی:

دۆزینەوەودەست بەسەراگرتنی ناوچەی جوگرافی راستەوخۆبوونە هۆی پەیدابوون و پێشکەوتنی بنەماکانی قانوونی نێودەوڵەتان وەکو:

١ـ هەر دەوڵەتێك هەر ناوچەیەکی بدۆزیبایەتەوە، دەستی بەسەردا دەگرت و دەیلکاند بە وڵاتەکەی خۆیەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

٢. گەلێ چوارچێوەی بنەمای قانوونی دانران کە تایبەت بوون بە قانوونی دەریاوە.

٣ـ پەیماننامەوریێکەوتننامەی نێوان وڵاتە ئەوروپییەکان مافوئەرکی تازەی بۆ دەوڵەتان دیاریدەکرد دەربارەی ئەو هەرێمو ناوچانەی کە هەر دەوڵەتێك داگیری دەکرد یا دەستی لێهەڵدەگرت بۆ دەوڵەتێکی تر.

**٤ـ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دادگاکانی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرانبەر ئەوروپییەکاندا: Copitulations**

پرنیسیپێکی خراپ پەیدابوو کە ئازادییەکی زیاد لە پێویست درا بە ئەوروپییەکان لەسەر خاکی وڵاتانی تر. بەگوێرەی پەیماننامەی نێوان سوڵتانی عوسمانی سلێمانی قانوونیو مەلیکی فەرەنسە فرانسوای یەکەم لە (١٥٣٥)دا، دەسەڵاتی عوسمانی نەیدەتوانی دادگایی فەرەنسیەکانی ناو سنووری دەوڵەتی عوسمانی بکاتو لێیان بپرسێتەوە، ئەمەش یەکسانی نێوان دەوڵەتانی شکاندو بووە هۆی ئەوەی ئەوروپییەکان بۆ سوود وەرگرتنو بەرژەوەندیی خۆیان، زیاتر نزیك بنەوە لەوڵاتانی ئیسلامی وەکو عوسمانیو مەغریبیو وڵاتە ئاسیاییەکان(چینوژاپۆن)، ئەم نەریتە یاساییە دەستی دەوڵەتانی ئەوروپای کردەوە کە زۆربەیان بچنە پەیماننامەی(١٥٣٥)ەوە، تابتوانن زیاتر دەست لە کاروباری ناوخۆی ئەو وڵاتانە وەردەن[٢٢].


منتدى إقرأ الثقافي

## ٥- کۆنگرەی وستفالیا:

شەڕوشۆڕی ناوخۆ بەهۆی جیاوازیی بیروڕاودەست درێژکردنە سەریەکتر ماوەی(٣٠)سی ساڵ درێژەی کێشا تا لە کۆنگرەی وستفالیا، ساڵی(١٦٤٨)کۆتایی هات و ئیمپراتۆری ئەڵمانی تێکچوو، سەرەنجام کۆنگرە دانی نا بەسەردانێتی(٣٥٥)دەوڵەتی تازەدا[٢٣].

ئیتر پەیوەندییەکی تازەی نێوان دەوڵەتانی ئەوروپا پێکهات و گەلێك لە شارەزایانی قانوونی نێودەوڵەتان، کۆنگرەی وستفالیا بەناسنامەی لەدایکبوونی یاسای تازەی نێودەوڵەتان دەزانن.

**بڕیارە گرنگەکانی کۆنگرەی وستفالیا ئەمانە بوون:**

١ــ دان پێدانانی هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆری ئەڵمانی و دابەشبوونی بەسەر چەند دەوڵەتی نەتەوەیی بچووکدا.

٢- باوەڕهێنان بەسەرداریێتی دەوڵەتان، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێبازی ئاینی کاتولیکی یا پرۆتستانتی و دەربازبوونی دەوڵەتان لە دەسەڵاتی بەرزی پاپا.

٣- باوەڕهێنان بە مافی دەوڵەت لەجەنگ و سەرداریيدا، ئیتر ئایدیای شەڕی(ڕەوا)و(ناڕەوا) نەماو دەوڵەت مافی خۆی بوو لە بڕیاردانی هەر شەڕێکدا.

٤. باوەڕهێنان بە پێکهێنانی نوێنەرایەتی دیبلۆماسی بەهۆی سەفارەتخانەوە، نەك بەهۆی نوێنەرایەتی کاتییەوە کە پێشتر هەبوو.


منتدى إقرأ الثقافي

٥- باوەڕهێنـان بـە پاراسـتنی ئاشـتیو یەکسـانیو سـنووری دەسەلاتی نێوان دەوڵەتان[٢٤].

لـەکۆنگرەی وسـتفالیادا، بـە ڕێکـەوتنی نێـوان دەوڵـەتان، پەیوەندی نێوانیانو بنەماکانی ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییە بووە هـۆی دروسـتبوونی سـەرەتایەکی جـێگیری بنـەماکانی یاسـای نێودەوڵەتان[٢٥].

## ٦- شۆڕشی ئەمەریکا( ١٧٧٥-١٧٨٣ )

ئـەم شۆڕشـە بـە سـەرکەوتنی جـەنگاوەرانی ئەمـەریکا بەسـەر کۆلۆنیـالیزمی بـەریتانیادا کۆتـایی هـاتو ئەمـەریکا لەبـەریتانیا دابـڕا. سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئەمـەریکا چـەند پرینسیپسـێکی تازەی هێنایە قانووز، نێودەوڵەتانەوە:

١ـ مـافی گـەلانی کۆلـۆنی بـۆ خـەباتکردن لـەدژی دەوڵـەتی کۆلۆنیالو ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی.

٢ــ دان پێـدانان بــە جــەنگاوەرانBelligerants وەکــو لایەنی(کەسی)یاسای نێودەوڵەتان.

٣ــ مــافی دەسـتێوەردان بەمەبەسـتی پشـتگیریی کردنـی جـەنگاوەران، هـەروەکو فەرەنسـە پشـتگیریی شۆڕشـگێڕانی ئەمەریکای کرد.

## ٧- شۆڕشی فەرەنسە( ١٧٨٩-١٧٩٥ )

شۆڕشی فەرەنسە کارێکی گرنگی کردەسەر پەیوەنـدی نێـوان وڵاتـانی دونیـاو ئـەنجامی دیـاری هـەبوو لـە گـۆڕینی جیهانو لـە قانوونی نێو دەوڵەتاندا.


منتدى إقرأ الثقافي

## ئەو چوارچێوەو بنەما یاساییانەی کە شۆڕشی فەرەنسە جێگیریکردن:

١ـمافی گەلان لە دیاریکردنی چارەنووسدا، بەتایبەتیش دانپێدانان بەسەرداریێتی گەلان نەك سەرداریێتیدەسەلاتداران.

٢. شۆڕشی فەرەنسە بەیاننامەی مافی مرۆڤو هاونیشتمانانی لە ساڵی(١٧٩٢)دا بلاوکردەوە، کە بووە سەرەتایەك بۆ بەیاننامەی جیهانی مافی مرۆڤ لە(١٩٤٨/١٢/١٠)دا کە لەلایەن رێکخراوی UN –ەوە بلاوکرایەوە.

٣. شۆڕشی فەرەنسە لەساڵانی(١٧٩٢،١٧٩٣)دا گەلێك بڕیارو بەڵگەنامەی دەربارەی رەفتارکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا بلاوکردەوە، کە زەمینەیەکی باشیان خۆشکرد بۆ قانوونی مرۆڤایەتی[٢٦].

پاش ئەم رووداوانە، کۆمەڵێك رێکەوتننامەو پەیماننامەو کۆنفرانسو بەڵگەنامەی جیهانی رۆڵێکی دیاریان هەیە لە یاسای نێو دەوڵەتاندا، تاکو جەنگی یەکەمی جیهانی،کە رێکخراوی(عصبة الأمم)پێکهاتو رووداوەکانی پاشتر تا جەنگی دووەم کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان زەمینەیەکی باشی پێشکەوتنی یاسای نێو دەوڵەتانی دارشت.

منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی چوارەم

# هەندێ لایەنی پەیوەندی نێوان یاسای نێودەوڵەتان و یاسای ناوخۆی دەوڵەت

ئەگەرچی چەند بیروبۆچوونێکی جیاواز هەیە دەربارەی پەیوەندیی نێوان یاسای نێودەوڵەتان و یاسای ناوخۆی دەوڵەت، بەلام پێشکەوتن و پەیوەندیی نێوان دەوڵەتانی دونیا ئەوەی سەلماند کە یاسای نێودەوڵەتان لەسەردەمی تازەدا باڵا دەستەو لەسەرووی یاساکانی ناوخۆی دەوڵەتەوەیەو پێداویستی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتانی دونیا و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی ئەوە دیاریدەکات کە پێویستە بنەماوپرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتان لە خزمەتی مرۆڤایەتیدابن، بۆیە سیستمی حوکمڕانی لە دەوڵەتدا هەرچیەك بێت، پێویستە یاساکانی ناوخۆی پشت بەیاسای نێودەوڵەتان ببەستێت و سەروەرییەکی پێببەخشێت.



منتدى إقرأ الثقافي

لەمێـژوی یاسـای نێودەوڵەتانـدا، دوورێبـازی دیـار هـەن دەربـارەی پەیوەنـدیی نێـوان یاسـای نیـو دەوڵـەتان و یاسـای ناوخۆ.

## ڕێبازی یەكەم :دووانەی هەردوو یاسا( إزدواج القانونين ):

ئەم ڕێبازە یاسای نێودەوڵەتان بەجیاو سەربەخۆ دەزانێت، لە یاسـای نـاوخۆی دەوڵـەت.بـەگوێرەی ئـەم ڕێبـازە، سەرچـاوەو بابەتولایەنـەكانی یاسـاو پێكهاتـەی یاسـایی هـەردوو(یاسـای نێودەوڵەتان ویاسای ناوخۆی دەوڵەت)لەیەك جیاوازن.

## ڕێبازی دووەم :یەكگرتنی هەردوو یاسا( وحدة القانونين ):

ئـەم ڕێبـازە یاسـای نێـو دەوڵـەتان و یاسـای نـاوخۆ بـە پێكهاتەیـەكی یـەكگرتوو دەزانێـت و لەیـەكیان جیاناكاتـەوە. بـەگوێرەی ئـەم ڕێبـازە دەوڵـەت، پابەنـدی بنـەماكانی یاسـای نێودەوڵەتانـەو دەسـتوری نـاوخۆی دەوڵـەتیش ئـەوە ڕەچـاو دەكات[٢٧].

هـەروەها دادوەریـی نێودەوڵـەتان(القضـاء الـدولي) دان بـەوەدا دەنێت كە دەسەڵاتی یاسای نێودەوڵەتان زاڵە بەسـەر یاسای ناو دەوڵەتـدا، ئەمـەش لـە كۆمـەڵێك بڕیـارو كـاری دادگاكـانی نێودەوڵەتیدا دیاریكراوە[٢٨].

دیـارە هەریـەك لـەم ڕێبازانـە بیروڕای جیاوازی لەسـەرە بـەڵام نـاتوانین سیسـتمی یاسای نێودەوڵـەتان بەسـەر یاسای نـاوخۆی


منتدى إقرأ الثقافي

دەوڵەت لەیەك دابڕین. بەتایبەتیش سەرخستنی یاسای نێو دەوڵەتان بەسەر یاسای ناوخۆدا لەم سەردەمەدا لە بواری نێودەوڵەتی و لەدەستورو یاساکانی ناوخۆی دەوڵەتاندا دیارو ئاشکرایە.

یاسای نێودەوڵەتانو یاسای ناوخۆی دەوڵەت نە لەیەك دابڕاونو نە یەك قانوونیشن. هەریەکەو سەربەخۆیی خۆی هەیە، بەلاّم پەیوەندییەکی توندوتۆلاو گرنگ لەنێوانیاندا هەیە، هیچ دەوڵەتێك بۆی نیە لە ناوخۆی خۆیدا بە پێچەوانەو دژیبنەماکانی قانوونی نێودەوڵەتان یاساو بڕیارەکانی خۆی دابڕێژێت بۆیە:

١- پێویستە دەو ەت لە داڕشتنو ڕێکخستنی قانوونەکانی ناوخۆیدا ڕەچاوی دەقو بنەما قانوونیەکانی نێو دەوڵەتان بکات. یا ئەوەتا لە دەستوری ناوخۆدا ئەو ڕێزگرتنە دیاریبکات، یا بە قانوونی تایبەت پەیوەندی دەوڵەت بە یاسای نێودەوڵەتانەوە دیاریبکرێ، یا دەکرێ لە قانوونەکانی ناخۆدا بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتان ڕەچاو بکرێو پابەندێتی نێونەتەوەیی نەشکێندرێت.

٢- هەر ناکۆکیەكو کەموکوڕییەك کە لەیاسای ناوخۆی هەر دەوڵەتێکدا هەبێت لە ئاستی قانوونی نێودەوڵەتاندا، دەوڵەت بەرپرسیار دەکات. هیچ دەوڵەتێکیش بۆی نییە خۆی دەرباز بکات بەو بیانووەی کە لە قانوونەکانی ناو خۆیدا تێکستی


منتدى إقرأ الثقافي

تایبـەت بـە ڕێزگـرتن‌و ڕەچـاوکردنی قـانوونی نێـو دەوڵـەتان نییە[29].

لەدوای تێگەیشتنی ئەوەی کە یاسای نێودەوڵەتان دەسەڵاتی لەسـەرووی یاسـاکانی نـاوخۆی دەوڵەتەوەیـە، ئـەوەمان بـۆ ڕووندەبێتەوە کە دەوڵـەت پابەنـدێتی دەکەوێتە ئەستۆ لەئاستی یاسـای نێودەوڵەتانـدا، چـونکە هـەر دەوڵـەتێك ئەندامـە لـە کۆمەڵگـەی جیهانیـدا، بۆیـە پێویسـتە بەرژەوەنـدیی‌وخێری مرۆڤایەتی لەبەر چاوبگرێت.

ئەگەر بە گوێرەی پابەنـدێتی نێونەتـەوەیی سـەیری ڕەفتاری حکومەتی عێراق بکەین، لەسیاسەتی ڕۆژانەیدا پێشێلکارییێکی دیاروترسناك بەرچاودەکەوێت.

عێراق یەکێکە لەئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوە یـەکگرتووەکان، ئـەو ڕێکخـراوەش بـەگوێرەی ئـەوەی بەیـەکگرتنی خواسـت‌و مەبەستی دەوڵـەتی دونیا پێکهاتووە، دەبێتـە یـەکێك لەکەسانی یاسـا، لەزانسـتی یاسـادا دەبێتـە یـەکێك لـە کەسـانی یاسـای نێودەوڵەتان. کەسانی یاسا، واتە ئەو لایەنانەی کە کەسایەتی یاساییان هەیەو بەشدارن لە پێکهێنانی بنەمای یاسایی لە نێوان دەوڵەتاندا.

دیـارە ئـەو لایەنانـەی کـە خۆیـان بنـەمای یاسـایی(قاعـدە قانونیـە) پێـك دەهێـنن، دەبێـت پابەنـدین بەجێبەجێکردنیـەوە. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو بنەما یاساییانەی کە دەربارەی مافی

منتدى إقرأ الثقافي

مرۆڤن، دەوڵەتان ئەگەر بەشداریش نەبن لە پێکهێنانیاندا هەر دەبێت پێوەیان پابەندبن، چونکە حوکمی ئەو بنەمایانە وەکو دەسەڵاتێکی بالا دەسەپێندرێت بەسەر هەموو دەوڵەتان و رێکخراوە جیهانیەکاندا.

جا عێراق وەکو یەکێك لە ئەندامانی رێکخراوێکی جیهانی کە بەدەقی نوسراو بەگوێرەی دەستوری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بەگوێرەی سەرجەم بەڵگەنامەکانی دیکەی ئەو رێکخراوە بەرپرسیارێتی نێونەتەوەیی لە ئەستۆدایە لەرێزگرتنی مافی مرۆڤدا. بۆجێبەجێکردنی ئەو بەرپرسیارێتیە پێویستەچ لەقانون و بڕیارەکانی ناوخۆی خۆیداوچ لەبواری جێبەجێکردندا بەکردەوە ئەوە بسەلمێنرێت کە ئەو ئەرکەی جێبەجێکردووە.

پێشەکی دەستووری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەر لەکاتی دروست بوونی ئەو رێکخراوە، ئەوە دیاریدەکات کە دەوڵەتان بەناوی میللەتانەوە ئەو بەرپرسیارێتیە دەگرن ئەستۆی خۆیان تا نەوەکانی داهاتوی مرۆڤایەتی لە کارەساتی جەنگ‌وجیاوازیی و نەژاد پەرستی بپارێزن. هەروەها باوەڕی دەوڵەتان بەمافە سەرەکیەکان و کەرامەتی مرۆڤویەکسانی لەنێوان میللەتان بەگەورەو بچوکیانەوە دیاریدەکات.

دیارە هەر بەگوێرەی ئەو پێشەکی‌یە، ئەو یەکسانییە بەهۆی کار ئاسانکردنەوە دێتە دی لەپێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئازادی دابینکردندا.


منتدى إقرأ الثقافي

ئەگەر سەیری سیاسەتی حکومەتی عێراق بکەین بەرامبەر بە مافی مرۆڤ بەگشتی و مافی مرۆڤی کورد بەتایبەتی، بەتەواوی لەبەرامبەر، نەك جیاوازی‌ونـاکۆکی رادەوەستین، بەڵکو جۆری پێشێلکردنەکانی عێراق، لەبەرامبەر کۆمەڵە تاوانێکدا رامان دەگرێت کە سەرجەمیان بەتاوانی نێو نەتەوەیی دەناسرێن.

لێرەدا چەند نموونەیەك لەپیادەکردنی سیاسەتی حکومەتی عێراق تۆمار دەکەین کە دەبینین هیچ رێزوحورمەتێك نەك بۆ پابەندێتی عێراق خۆی، بەڵکو بۆ مرۆڤ دانەنراوە.

لەم چەند بەڵگە نامەیەی حکومەتی عێراقدا میکانیزمی کارکردنی دەزگاکانی حکومەتمان بۆ روون دەبێتەوە لەپیادەکردنی سیاسەتی، یەکەم: دابڕینی مرۆڤی کورد لەخاکی خۆی، دووەمیش:دەست بەسەراگرتنی مرۆڤی کورد بەوجۆرەی ئەو دەست بەسەراگرتنە کۆنترۆڵێکی تەواوی ئازادی ژیان‌و یارییکردن بێت بەئیرادەو دیاریکردنی شوێنی ژیانیش بێت.

لێرەدا باس لەوەناکرێت کە بچینە سەر ئیسپاتکردنی کوردستانی بوونی شاری کەرکوك‌و بەڵگەی مێژوویی بهێننەوە بۆ ئەو مەبەستە بەڵکو نموونەی ئەو بەڵگەنامانەی حکومەتی عێراق خۆی نیازی خراپی کاربەدەستانی عێراق دەردەخات لە بەرامبەر رەگەزی کوردا، جا ئەگەر خەڵکی کەرکوك(وەکو تاك) سەیر بکەین لەکەسانی میللەتی کورد، ئەودەگەینە ئەو ئەنجامەی لەکاتێکدا سیاسەتی حکومەتی عێراق بەرامبەر


منتدى إقرأ الثقافي

